# ڕۆژانی سەخت
# و
# شەوانی چیا

بیرەوەری



یاداشتەکانی
کەریمی عەبدوڵڵا مارف



چاپی دووەم




حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەرێوەبەرایەتی گشتی راگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەرێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر

سەرپەرشتیاری گشتی
ماجید نووری

# ڕۆژانی سەخت و شەوانی چیا
## ((یاداشتەکانی کەریمی عەبدوڵڵا مارف))


نووسەر: کەریمی عەبدوڵڵا مارف
بابەت: بیرەوەری
پیتچنی: مەریوان ئەحمەد
هەڵەچنی: دڵشاد قادر
نەخشەسازی ناوەڕۆک: سۆزان محەمەد عەزیز
نەخشەسازی بەرگ: ئامانج ئەمین
تیراژ: ٥٠٠ دانە
چاپ: چاپخانەی ڕۆشنبیری
نرخ: ٣٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
ژمارە سپاردنی (٢٤٥٩) ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە

## پێشکەشە:

-بە گیانی پاکی باوکی بەڕێزمان (عەبدوڵڵا مارف ئاغا)
- بە کاکە خەلیفەی برام
-بە دایکی خۆشەویستم شەمسە عەبدوڵڵا عەبدولڕەحمان
-گشت شەهیدانی ڕێگای ئازادی و سەرفرازیی کورد و کوردستان.
-بە هەموو ئەوانەی لە پێناوی ئازادی گەلەکەمان بوونە پێشمەرگە.
-بە منداڵانی شەهیدە سەربەرزەکانی کوردستان

# سەرەتا

کاتێک هەستی مرۆڤ دەبزوێت بۆ گەڕانەوەو گەشت کردن و پێداچوونەوە بەو کارو چالاکی و هەڵسوکەوتانەی پێشووی خۆیدا. یان بۆ بینینەوەو گێڕانەوەی کاتێکی لەدەست چوو لە زەمەن و ژیانی شیرینترین ساتەوەختەکانی گەنجایەتی. دەرئەنجام بە کۆمەڵێک وێنەو تابلۆی ڕەنگاو ڕەنگ دەگاتەوە. ئەو وێنەو تابلۆ ڕەنگین و وێستگانەی کە تایبەتن بەخۆی، کە هەندێجار و لەهەندێ شوێندا دەبێتە بەشێکیش لە ژیانی ئاسایی خەڵکی تر یان دەبێتە بەشێک لە ژیان و خەباتی هەموو خەڵکانی ئازادیخواز، بگرە لە هەندێ جارو لەهەندێ وێستگەدا دەبێتە بەشێک لە ژیانی سیاسی و خەبات بۆ سەرفرازی میللەتێک، جگە لەمانەش ئەو ڕەنگ و تابلۆ و وێستگانە خاڵی نییە لە یادەوەری تاڵ، هەروەک چۆن پڕیشێتی لە یادگاری شیرین و سەرکەوتنەکانی شۆڕشەکان.

دیمەنەکانی منالی لەمێشک و هزردا زۆر جاران کاڵدەبنەوە بەجۆرێک تا دەگاتە لەبیرکردن و دواتریش لەگەنجینەی مێشکدا هیچ تۆمارێک بەجێ نامێنێت. بەڵام هەندێ وێنەو ڕووداو و هەن بەهۆی کاریگەری و گەرم و گوڕی خۆیەوە هیچ شتێک نییە لە مێشک و هزری تۆدا بیانسڕێتەوە بۆیە بیرچوونەوەی ئەو وێنەو ڕووداوانە مەحاڵە. هەر هی ئەوەیە بیری تیژی منالی دەقاودەق دەتگەڕێننەوە بۆ سەرەتاو سەرەداوی ڕووداوەکان. نەگەڕانەوە بۆ تۆمارکراوەکان و وێنە تۆمارکراوەکانی چاو و هزرو بیری مرۆڤ دەبێتە هۆی فەوتانی زۆرێک لە ڕووداوەکان. بێ شک لەگەڵ باڵابوونی تەمەن و سەرکەوتنی تەمەن بەرەو سەرروەترو نەشونما کردنی جەستە، یاداشتەکان لەسەریەک کەڵەکە دەبن و چڕتر دەبنەوە. تەرخان کردنی ساڵانێک بۆ نووسینەوەو تۆمارکردنیان لەفەوتان ڕزگار بوونی ئەو وێنەو ڕووداوانەیە، بۆتە مێژوویەک کە دەشێت بووترێت ئەم جۆرە مێژووانەو نووسینەوەو خوێندنەوەیان بە جۆرێک لەجۆرەکان،

نەوەکانی دواتر لێی سوودمەند بن. بەتایبەتیش ئەگەر تۆ بەشێک بووبیت لەنـــاو بزاڤی نەتەوەیی و ڕزگاریخوازی گەلی کورددا، کە خۆشـــبەختانە لە بیســـت ســـاڵی ڕابردووەوە لە پاش ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ و ڕامالینی دیکتاتۆریەت لە کوردستانی باشوورو دواتریش ڕووخانی ڕژێمی بەعـــس و ســـەدامی دیکتاتـــۆرو دەرفەتی گـــەورە بۆ هەمـــوو چین و توێژەکان و بەتایبەتیش نیشـــتمانپەروەرو تێکۆشـــەرەکان ڕەخســـا کە یاداشت و بیرەوەریەکانیان و وتارەکانیان بنووسنەوەو بە چاپی بگەیەنن و بڵاوی بکەنەوە، بەم کارەشیان کتێبخانەی کوردییان دەوڵەمەندتر کرد، لەهەمان کاتیشـــدا بەم کارەیان تاڕاددەیەکـــی باش توانییان مێژوویەکی هاوچـــەرخ بۆ کوردو کوردســـتان زیندوو ڕاگرن، کە دەشـــێت خەڵکانی پســـپۆڕ و شـــارەزاش کە کاریـــان لـــە لێکۆڵینـــەوەو بەدواداچوون و هەڵســـەنگاندنە لە مێژووی گەلان و گەلی ئێمەی کورد و ســـوودمەندبن لێی و زیاترو زۆرتر لە شەن و کەوی بدەن و ڕوئیاو ڕوویەکی سەردەمانە و وەک ئەتەکێتێکـــی هاوچەرخانە بیخەنەوە بەر دەســـت و چاوی ئێمەو نەوەکانی پاش ئێمەش.

ئـــەم کارەی بەندە کە نووســـینەوەی یاداشـــت و بیرەوەریەکانمەو بەتایبەتی هی ئەو ســـالآنەیە کەپێشمەرگەبووم، پانتاییەکی گەورەیە لە ژیانمداو هەر ئەویشـــە بۆتە باشترین وەسیەت و سەرمایەو جێی فەخرو شانازی.

هیوادارم توانیبێتم دوور لە زمانی زبرو چەواشـــەکاری و پشـــت گوێ خســـتنی کەس و ناو زڕاندنی تێکۆشەران، ئەم کارەم سەرکەوتووانە بە ئەنجـــام گەیاندبێ،هەڵبەتە هیچ کارێکیش بێ کەم و کوڕی نابێ،چوونکە وەک ئامـاژەم پێکرد بە زمانێکی سادەو ساکار یاداشتەکانم نووسیوەتەوە هەر وەکو خۆی دەقاو دەق بێ جوانکاری سبووغدان لە وشە هۆنینەوەدا، ئەمە پوختەی یاداشـــت و بیرەوەریەکانی خۆم و بنەماڵەکەمە، هیوادارم سوودمەند بێ بۆ گشت لایەک.

# دەستپێک

خوێنەرانی خۆشەویست وهاوڕێیان و دۆستانی ئازیز...

ئەم بەرهەمەی کە لە بەردەســـتاندایە، وەکو کتێبێکی مێژوویی تێی مەڕوانە ئەگـــەر هاتوو بابەتی مێژوویت بەرچاوبکەوێت، تەنیا بەشـــێک لە وێســـتگەکانی ژیانی خۆمەو یاداشـــتم کردون بۆ مێژوو.. چونکە هیچ مێتودێکی زانستیانەی مێژوونووسی تێدا ڕەچاو نەکراوە. شرۆڤەی مێژووی بزووتنەوەی سیاسی کورد بەخۆم ڕەوانابینم، نووسینەوەی سەر لەبەری یادەوەرییەکانی من لە شۆڕش و خەباتی تێکۆشانی لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستاندانە، زیندووکردنەوەی ئەو وێنانەی سەردەمێکی ژیانی منن، کە لەسەختترین ڕۆژگاری خەباتی شار و شاخ و تێکۆشانی پێشمەرگایەتیدا لە هزرمدا نەخشاون، زەمەن تۆزی لەسەر خستوون، نووسینەوەی ڕووداوی چەندین ساڵە بەهەموو شەو ڕۆژو هەفتەو مانگ و چرکە ساتەکانیەوە لە ئاڵۆزترین پرۆســـەی ژیان و هەڵسوکەوتی خەباتی پێشمەرگانە، خەباتی شاخ و ناوشار و گوزەرانی بن ئەشکەوتان و ڕێکردنی هەورازو نشێوان و برسێتی هەڵلەرزینی ناو بەفروباران و هەڵپژانی خوێنەکان و شاردنەوەی تەرمی ئازیزان و ساڵانێک لەتەمەنی ڕوودانیان کارێکی سەرپێی و ئاسان نییە.

لەمـــەودای دووردا ئازارەکانـــی تاکـــی کوردی لـــە دۆزەخی جەنگ هاوێژراوەو جەخت لەسەر دووبارە خولْقاندنەوەی دڵەڕاوکێکانی کۆمەڵێک مرۆڤ دەکات کە زوڵم و ســـتەمی بەعس لەسونگەی کوردبوونیاندا ناوی کۆمەڵێـــک کەس هاتوون کە هەندێکیان ئەو ڕۆژگارە و ئێســـتاش ڕۆڵی گرنگیان لەهەڵسوڕانی لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان گێڕاوەو ناساندنی هەندێ لەکەسەکان، هەوڵی زیندووکردنەوەی ئەوانەم داوە کە شەهیدبوون و بوونەتە پێشمەرگەی ون یاخود زیندوون و ڕۆژگار فەرامۆشی کردون.

دووباره دەیڵێمەوە بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە لە یاداشتەکانم مەڕوانن، بە زمانێکی زۆر سـادە وێنەی وێسـتگەکانی ژیانم نووسیوەتەوە لەگەڵ ناوهێنانی کۆمەڵێک هاوڕێی خۆشەویسـت کـە هەندێکیان بە خوێنیان گوڵی ئازادی و سەربەستییان ئاوداو ئەمڕۆی لێ سەوزبوو هەندێکیشیان ئێستا لە ژیاندان و درێژە بە خەبات و تێکۆشان ئەدەن .

هیـوادارم توانیبێتم بەم بەرهەمەش کتێبێکـم لەکتێبخانەی کوردی زیاترکردبـێ بـۆ دەوڵەمەندکردنی مێژووی نەتەوەیمان. لە کۆتاییشـدا سوپاسی هەموو ئەو دڵسۆزانە ئەکەم لە هاوکاری کردن و بیرخستنەوەی هەر زانیارییەک، وەک خشتێک لە بیناکردنی وشەکانی ئەم بەرهەمە.

## نووسەر لەچەند دێڕێکدا

(کەریمی عەبدوڵڵا مارف)،لە دایکبووی ساڵی ١٩٥٩ لەشاری سلێمانی و گەڕەکی سەرشـــەقام لەنێو بنەماڵەیەکی نیشتیمانپەروەر چاوی بەدنیا هەڵهێنا، حەوت برا و پێنج خوشـــکن ( کاک عەلی، کاک عوسمان،،کاک عومەر، کاک لەتیف، کاک حەمە شریف، کاک خەسرەو، گوڵزار، فاتیمە، قومری، جەمیلە،شـــیرین ) پێـــک هاتووین، کە پێکهاتـــەی بنەماڵەی ( عەبـــدوڵا مارف) پێـــک دەهێنن. لەو دەورووبەرەی تیایـــدا دەژیام هەموو کەسەکان و ڕووداوەکان بیر خەرەوەیەکی بەردەوام بوون بۆ من و خەڵکی تر کە ئێمە لەم نیشتمانەدا بەڕاستی داگیرکراوین بە بەردەوامی کەرامەت و ژیانمان پێشـــێل دەکرێ. بێ دەنـــگ بوون لەو هەموو تاوانە گەورانەی لـــە دژمان دەکرا هێندە هێنـــدە نرخی مرۆڤ لای خۆی کەمدەکاتەوە کە بەڕاســـتی چیدیتر ناتوانی بەڕاســـتی ڕێزی خۆی بگیرێ. شانازی کردن بەوەی کە مرۆڤین و هیچمان لە کەسی دی کەمتر نییە، ئازاین، زیرەکین و کەرامەتمان هەیە کۆمەڵێک بیرۆکەو ئاواتن کەسی بێ بەش نییە لێیان، کە ئیرادە داگیرکـــراوە بەدیل کراوە خەونیان پێـــوە دەبینێ، درۆیەکی گەورەیە و خۆ هەڵخەڵەتاندنە تا ڕادەی نەخۆشـــی و وڕێنە و دابڕان لە واقیـــع. کاتێ لەخۆت دەگەڕێی خەوبینین و داڵغەکانت درێژە بکێشـــن، ئەوکاتە خەونت لێ دەبێتە ڕاســـتی، خەوبینین دەبێتە ژیان تا وەک نرخ لەکاردەکەوێ. وتراوە ناتوانرێ گەلێک بســـڕدرێتەوە و لەناو ببرێ، بەڵام لەڕاستیدا گەلان هەبوون لە ڕابردوودا ئێستا تەنیا ناوەکانیان ماوە ئەویش لەکتێبەکانـــی مێژوودا. گەلی زیندووی ئامـــادە بۆ قوربانیدان لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجەکانی دەتوانێ ئێستاو داهاتووی خۆی بپارێزێ.

دەورووبەرو تێپەڕبوونـــی ڕۆژگار فێری کردم کە چەندە گرنگە هەموو تاکێکـــی کـــورد خاوەنی ئیرادەی ئـــازاد بێ ئەگەر هەر چوار پەلیشـــی نەبێ هەمیشـــە بە گوفتـــارو ڕەفتار بە خراپـــەو زۆرداری بڵێ نەخێر و لایەنگیری سەربەخۆیی و ئازادی و چاکە بێ. زۆر گرنگە هەوڵ بدرێ کە

کوردســـتانی سەربەخۆ لە مێشکی هەر تاکێکی کورددا بنیات بنرێ پێش هەر هەنگاونانێکی تر. چەکی کورد ســـووربوونییەتی لەسەر گەیشتن بە ئازادی و سەربەخۆیی و سەرفرازی. ئەمانە هەموو وروژێنەری بەردەوامی دەروون بوون. لە سلێمانی لە گەڕەکی سەرشەقام چاوم بە دنیا هەڵهێنا. سەرشەقام وەک گەڕەک و شارەکانی تری کوردستان دەوروبەری هاندەری یەکەمین بوو بۆ بەگژاچوونەوەی ناڕەواو بگرە هەر بۆ خۆی قوتابخانەیەکی ســـەرەتایی بوو بۆ فێربوونـــی کوردایەتی. لەم گەڕەکەدا زۆرێ لە لاوانی هەمیشە گەڕۆک بەدوای پرشنگی خۆر تاک لە دوای تاک و پۆل لە دوای پۆل ڕوویان لە چیاکانی وڵات دەکردو دەبوونە پێشمەرگە. چەندینیان لێ گەیشتە لوتکەی خۆشەویستنی وڵات وگەیشتنە کاروانی سەروەری.کاتێک بە دەوروبەری خۆمدا دەمڕوانی لە نیشـــتیمانێکی داگیرکراو بندەســـتی دوژمنان دەژیم و لە گەڕەکێ چاوم بەدنیا هەڵهانی کە ناوی سەرشـــەقام بـــوو، خۆی لە خۆیـــدا قوتابخانەیەک بوو بۆ پێگەیاندن و گۆشـــکردنی کوردایەتی و بزواندنی هەستی نەتەوایەتی کە کۆمەڵێک کەڵە شۆڕشگێڕ لەهەمان گەڕەکدا بوون و دواتر گەیشتنە کاروانی سەروەری. لە قوتابخانەی ســـەرەتایی (ئەیوبی) لە گەڕەکی سەرشـــەقام ناونووس کرام و کەوتمە بەرخوێندن و خەیاڵی فێربوونی ئەلف و بێی کوردی و لەوێشـــەوە ئاشنا بوون بە منداڵانی گەڕەکەکانی تر، ئاشـــنابوون بە ئەلف و بێی کوردی و ناسینی ئەو منداڵانە هێندەی تر قوتابخانە و مامۆستای لا شیرین دەکردم، کاتێکیش دەگەڕامەوە ماڵەوە ئەوەی پاڵپشـــت پشتگیرم بوو بە تایبەتی باوکـــی بەڕێزمان بوو کە زۆر حەزی دەکرد منداڵەکانی خوێندەواربن،ئەو کەسایەتێکی ناسراوی عەشیرەتی مەنمی بوو، خۆشەویست و خەمخۆری هەموو خزمان بوو. لەنێو شـــاری ســـلێمانیش ڕێزێکی تایبەتی هەبوو لە نـــاو خەڵکداو متمانەیەکی تەواویان پێی هەبوو بۆ هەرکارێک ڕووبەڕووی بکرایەتەوە.



## عەبدوڵڵا مارف- ١٩٥٨ شاری سلێمانی

باوکم عەبدوڵڵا مارف ئاغا لە ساڵی١٩٣١ خێزانی پێکهێناوە.

باوکم لە ساڵی ١٩٣٠دا کە پۆلیسی نیزامی دروست ئەکرێ بۆ شاری سلێمانی، کە دادپەروەری دائەمەزرێنن ئەم سێ کەسایەتیە دادەنێن بۆ بەرقەرار بوونی دادپەروەری لە شاردا.

١. عەبدوڵڵا مارف ئاغا، ٢. خوولە ئامە، ٣. بابە شێخ.

هەر یەکە لەم سێ کەسایەتیە دەکرێن بە ئامر مەفرەزەی گەڕۆک بۆ شارو لادێکان.

باوکم لەدوای ماوەی چەند ساڵێک بەردەوام ئەبێ بەتایبەتی لە ناوچەی قەڵادزێ لە گوندی شێنێ ئامر مەرکەز ئەبێت.

لە ساڵی ١٩٥٠کاندا لەبەر چالاکی و بەرقەرار بوونی دادپەروەری، دەیگوێزنەوە بۆ ناوچەی شارباژێڕ بۆ گوندی وڵیاوە. لە وڵیاوە دەبێت بە ئامر مەرکەز بە پلەی ڕەیس عورەفای پۆلیس. مەلا ڕەئوفی باوکی عەطوف، کە خزمایەتیەکمان هەیە لەگەڵیدا، کە ئەزانێت باوکم نەقڵی ئەوێ کراوە جواب بۆ خولە پیزە ئەنێرێ ئاگاداری ئەکات کە عەبدوڵڵا مارف خزمی خۆمانە و گوێزراوەتەوە بۆ شارباژێڕ بچۆ میوانداریەکی بکە. شەوێکیان، خولە پیزە و تاهیرو تالیب و ڕەحیمی برای لەگەڵ خولە سەلکەی ئامۆزا و ژن برای خولە پیزە، سەردانی ماڵی باوکم ئەکەن لە وڵیاوە. ئەچنە ژوورەوەو دادەنیشن، بە باوکم ئەڵێن (ئێمە زۆر خۆشحاڵین کە تۆ هاتووی بۆ ناوچەکەمان) باوکم پێیان دەڵێت، چۆن زانیوتانە کەمن گواستراومەتەوە بۆ ئێرە؟ ئەوانیش دەڵێن کە مەلا

ڕەئووف جوابی بۆ ناردوین پێی ڕاگەیاندوین کە لەگەڵ تۆ خزمایەتیەکمان هەیـــە. باوکم دەڵێت خۆتـــان دەزانن من هاتووم بـــە فەرمانی عومەر عەلی پارێزگار کە ئێوە دەســـتگیربکەم یـــان لەناوتان بەرم. مادەم وایە قووەتی نیزامی پۆلیســـی و قووەتی سەیاری هەمەوەنی زۆر هاتووە بۆ شـــاربازێڕ، داواتان لێ دەکەم لە بەیانی زووتر نییە ماوەیەک بچنە دیوی ئێران، تاوەکوو وەزعەکە ئەهوەن ئەبێتەوە. ئەوانیش بە ئامۆژگاریەکەی باوکم ڕازی ئەبن و ئەچن بۆ دیویی ئێران، ئەو شـــەوە زیاتر لە ٤سەعات دەمێننەوە، ئەوەی شـــایەنێ باســـە ئەوەیە کە خولە سەلکە و تاهیری برای ئێشـــککگر ئەبن لە دەرەوە، دوای ماوەی چەند ڕۆژێک عومەر عەلی موتەسەڕیف دەنێرێت بەشـــوێن باوکم دا، باوکم دەچێت بۆ لای، عومەر عەلی ئاگاداری ئەکات من تۆم ناردووە بۆ شـــاربازێڕ کە چەتەکان بگری یـــان لەناویان بـــەری نەک لەگەڵ چەتەکاندا کۆبوونـــەوە بکەی لە ماڵی خۆتاندا. باوکیشـــم پێی دەڵێ شتی وا ڕووی نەداوە. عومەر عەلی دەڵێ بەڵێ ڕاســـتە بووە. باوکیشم پێی دەڵێ کێ پێی وتوویت؟ ئەویش دەڵێ موعاونـــی چوارتا ئاگاداری کردوم. باوکیشـــم پێـــی دەڵێ ئەگەر معاون ڕاســـتی ئەکرد بۆ لەوکاتەدا ،کە ٢ ســـەعات لە چوارتاوە دوورە، نەهات خـــۆم و منداڵەکانم و میوانەکانمی لەنـــاو نەبرد. بەڵام گەورەم دیارە درۆ ئـــەکات. ئەزانێت کە تۆ ڕێز لەمن ئەگری، بۆیە ئەمەی دروســـت کردوە. بەڵام باوکم بۆی دەرکەوتبوو کە کەناسی مەرکەزەکە خەبەری بردووە بۆ معاونەکە و ئاگاداری کردبوو.

باوکم هەتا وەکوو لەو ناوچەیەدا بوو تووشی هیچ کێشەیەکی پێکدادان نەبوو لەگەڵ خوولە پیزەدا. هەرکەســـێکیش تاوانبار بووبێت لە کێشەی کۆمەڵایەتـــی یان تاوانێکی گەورەی کردبێ، بەندی کردوەو تەســـلیم بە دادگای کردوەو بەپێی یاســـای ئەوکاتە مامەڵـــەی لەگەڵدا کراوە. ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە باوکم لەوکاتەشدا حەزی نەکردووە کە پیاوی ناوداری گەلەکەمان شەهید بێت.

بۆ سەردەمانێک یاسای داگیرکەر کە هەمیشە دژ بە کورد بووە تاکە یاسای کارپێکراو بووە بەو پێیە سەپێنراو بووە لەکوردستاندا، یاسایەک بووە لەبنەڕەتدا بۆ بەرژەوەندی داگیرکەر هێنراوەتە کایەوەو چ بایەخێکی بە دابینکردنی دادپەروەری لەژیانی کورددا نەداوە، لەبەر ئەوە شـــتێکی سروشتییە کە تاکی کورد بەگشتی نەوەک هەر ڕێزی لەو یاسایە نەگرتووە، بەڵکو بەردەوام شـــکاندویەتی و سەرپێچی کردووە، بگرە دژایەتیکردنی یاســـا بەجۆرێ لە کاری نیشـــتمانپەروەرانەش ژمێردراوە لەکوردستاندا، چوونکە دژایەتی کردنی ناڕەوایی بووە. وەک وتمان درێژەکێشـــانی باری ژێردەســـتەیی و داگیرکراوی بۆ سەردەمانێک وای کردووە کە لە دەروونی تاکی کوردا یاسا بیرخەرەوەی ناڕەواو زۆرداری بێت. ئەگەر هەندێ جاریش لایەنێکی ئەو یاسایە باش بووبێ، یان بگرە هەندێ سوودیشی بووبێ هەر قبـــووڵ نەکراوە لەلایەن تاکی کـــورد و دژایەتی کردووە. بۆ نموونە جار بووە خەڵکێکی هەرزەکار بە شـــکاندنی گڵۆپی بەر شـــەقامەکان خۆیان گوزارشـــتیان لە ڕقی خۆیان بۆ دەسەڵاتی داگیرکەر و یاساکەی کردووە.
کاتێ ناڕەوایی و زۆرداری زۆربەی بوارەکانی ژیانت لێ دەتەنێ. بەو پێیە کاردانـــەوەی بۆ مرۆڤی گیرۆدەش بەو زۆرداری و ناڕەواییەوە لە زۆربەی بوارەکانـــی ژیانی دا ڕەنـــگ دەداتەوە بەو پێیە ســـەیر نەبووە کە هەر کوردێک کاردانەوەی توندوتیژی بووبێ هەتا لەوکاتانەشـــدا کە پێویستی بەکاردانـــەوەی توندوتیژی بەرامبەر کوردێکی تری وەک خۆی گیرۆدەیی باریی ژێردەستەیی بووبێ. وەک ئەوەی کەسێک بۆ ماوەیەکی درێژ بخەیتە ژێر فشـــارێکی بەردەوامەوەو ئازادی دەکەی لەوەی کە چ کاردانەوەیەکی پێ دروســـتە ئەوە بکات. کاتێ ئەو کەسە لە ژێر فشارەکەش دەردەکەی واتە دێتەوە باری ئاســـایی بێ فشـــار، دەبینی بۆ ماوەیەک هێشتا هەر کاردانـــەوە توندەکەی ماوە هەرچەندە لەژێر فشاریشـــدا نییە. دەروونی وروژاوە بە حوکمی درێژە کێشـــانی ماوەی بوونی لە ژێر فشاردا. دەکرێ بووترێت کاردانەوەی توندوتیژی کردۆتە شێوازێ بۆ خۆپاراستن بۆ مانەوە بۆ خۆناســـاندن بە خەڵکانی تر، چوونکە لەوانەیە لە قووڵایی دەروونیدا

پێی وابێ ئەگەر بەمجۆرە نەبێ، توندوتیژ نەبێ ڕێزی لێ ناگیرێ. ژیان و کەرامەتی پارێزراو نابێ. بۆی هەیە جارێکی تر بکەوێتەوە ژێر فشار، هەر فشـــارێ لەهەر جۆرێ. لەبەرئەوە هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە دەکات، یان لەوە دەترسێ بکرێتەوە نێچیر هەربۆیە پێش ئەوەی هێرشی بکەیتە سەر ئەو هێرش دەبات، زۆربەی جار بۆســـەر ئەوانە کە لەڕاستیدا مەترسیەک نین بۆ ئەو، دەروونێکە متمانە ناکات. لەبەر ئەوە بەڕاســـتی گێڕانەوەی متمانە بۆ تاکەکانی کۆمەڵگە بە یەکتری و باوەڕ بەخۆیان کە دەتوانن بە هێمنـــی بژین، بێ ئەوەی ناچار بن لە زۆربەی کاتەکان چ کاردانەوەیەکی توندیان هەبێ، بێ ئەوەی پێویستیان بەوە بێ لە نرخی کەس داگرن تا نرخی خۆیان بپارێزن، دووبارە دامەزراندنەوەی کۆمەڵگەیەکی تەندروست و ســـاغ بۆ خۆی پرۆژەیەکی نەتەوەییە کـــە زیاترین گرنگی هەیە. لەوە دەچێ زۆربـــەی هەرە زۆری ئێمەی کورد کەم یان زۆر کارتێکراو بووبین بەو فشـــارە بێ ئەنـــدازە درێژخایەنەی کە ئەتمۆســـفیرێکی داگیرکردن خولقاندبووی لەولاتەکەمان و هەتا ئێســـتا کاریگەری لەسەرمان هەرماوە و کوردەواری زیانی هەســـت پێکراو و هەست پێنەکراوی زۆر گەورەی لێ کردووە و کاتی ئەوە هاتووە وردە وردە و بە هێمنی بەڵام بە دڵســـۆزی چارەسەری خۆمان بکەین.

بە داخەوە ڕووداوێکی عەشـــایەری ڕووی داو هەموولایەکی نیگەران کردبوو کەپێشـــتر هاتبوون بۆ لای باوکی بەڕێزمان لەگەڵ چەند پیاوێکی ڕیش سپی عەشیرەتەکان، پەیمان و بەڵێنیان دا بوو بە باوکم کە هەموو کاتێک وەکو مامێک تەماشـــای بکـــەن ، بە هۆی هەڵەی هەندێ خەڵکی نائاقڵەوە هەموو ئەو بەڵێن و گفتانە هەڵوەشایەوەو تا کارگەیشتە ئەوەی دەســـتی تاوان بگاتە پیاوێکی ڕیش سپی و لە ساڵی ١٩٦٤ لە تەمەنی ٦٩ ســـاڵی دا شـــەهیدی بکەن و لەخەڵکی دووربخەنەوە بۆیەکجاری و دڵەمەزن و گەورەکەی کە بۆ خۆشەویستی خاکی کوردستان و کوردایەتی داگیری کردبوو لە لێدانی بخەن.

لەکاتـــی ڕووداتی کارەســـاتەکەدا هاوڕێیەکی باوکـــم بە ناوی حاجی ســـاڵحی عەلی قوباو، تەمەن ٦٨ ســـاڵ بوو، کەخاوەنی چاخانەکەبوو هـــاوڕێ و خۆشەویســـت و برای گیانی بەگیانی باوکـــم بوو، بکوژانی لە نەفامی و شـــپرزەیدا شـــەهیدیان کرد. کاتێک هەردووکیان هێنانەوە بۆ بەردەمی ماڵەوە دواتر بەرەوگۆڕســـتان بەڕێ کـــران لە نێو ئاپۆڕایەکی جەماوەری زۆری خەڵکی شاری سلێمانی.

. ڕۆژگارەکانی ئەوساو بە ئێستاشەوە لە نێو کۆمەڵگای کوردەواری،بوونی بـــاوک لە نێـــو پێکهاتەی خێزاندا کۆڵەگەیەکی پتـــەوی مانەوەو بەرەو پێشـــچوونی بووە نەک هەر لـــەڕووی دابین کردنی بژێـــوی ژیان بەڵکو بەخشـــین و لێوە فێربوونی پەروەردەشـــی لە ئەســـتۆ گرتنی بووە کە منـــداڵ بەرەو ڕێڕەوی چاکەو پیاوەتی و ئایندەی گەش و دوا ڕۆژ بەرێ.

ئێمەش باوکمان وەکو هەموو ئەو باوکە باشـــانەی کە لە دنیادا ناویان درەوشـــاوەیە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا،باوکێکی پڕلـــە ئەزموونی ڕۆژگار و خۆشەویســـت بە کۆمەڵگاکەمان عەبدوڵڵای مارف ئاغا بوو بەڵام دەستی قەدەر و ڕۆژگاری ســـتەمکار لە ئێمەی منداڵ ئەو هەستەی کە بە ئایندە هەمـــان بوو لە پاڵ ئەم باوکە بەڕێز چاکـــەکارەدا هەمووی بوونە گەڵای پایز و هەڵوەرین وەک فرمێســـکەکانی چاومان،بە ڕاستی لە دەست دانی باوکیش لەو ســـەردەمەدا کە سەردەمێکی سادە و ساکاری پڕ لە ڕووداو بێ، دەبێ چۆن لە ژیان بڕوانیت و هەنگاوی لەگەڵ بنێی؟!!!!

لـــە دوای ئەم ڕووداوە و نەمانی باوکم لە نێوماندا، لەپایزی ســـاڵی ١٩٦٤ دا ماڵمان گواستەوە بەرەو گەڕەکی مەجیدبەگ بۆ لای نزیک کاکی گەورەمان کاکە (عەلی و کاکە عوسمان)، لەوێش لە نێو ماڵێکی مام ناوەند و گەڕەکی هەژارنیشینی شاری سلێمانی ژیانمان بەڕێ دەکرد لەگەڵ ئەو بارودۆخەی نێو ماڵەکەمان و شـــارەکەمان کە بە بارودۆخێکی ســـەختدا تـــێ دەپەڕی لە ڕووی سیاســـی و گوزەرانی ناخۆش و هەڵســـوکەوتی کاربەدەستان وحکومەتی ئەوسای وڵات و بڵێسەی گڕی شۆڕش و بوونی پێشمەرگە لە چیاکانی کوردستان،لە نێو گێژاوی ئەم هەموو تەموژیەی

ژیانـــدا دوور لەبن باوکـــی و پەروەردە کردن و چاودێـــری براکانمان بە هەمیشـــەی ڕێنماییـــان دەکریـــن وکەوتینەوە بەر خوێنـــدن لە گەڕەکی مجیدبەگ ،لەگەڵ قورســـی ژیان و بەڕێ کردنـــی وەک منداڵێک کەوتمە کێشـــمەکێش کردن لەنێوان خوێندن و ژیان. بۆیە لە پۆلی شەشـــەمی ســـەرەتایی نەمتوانی پەرە بە خوێندن بـــدەم و وازم لە خوێندن هێناو لە قوتابخانە دابڕام کە ئەمە ناخۆشـــترین بڕیـــارم بوو بۆکۆتایی چوونم بۆقوتابخانە کە ڕۆژگارەکە یەخەی پێ گرتم.

لەگەڵ ڕەورەوەی ژیان وکارکردنی ڕۆژانەم و بزوێنەری بیری کوردایەتی و شۆڕشـــگێڕێتی لە نێو گەنجان ولاوانی کورد و هاوکاری کردنی شۆڕش باس و خواستی هەموولایەک بوو ، منیش وەک هەموو ئەو لاوانە زۆر لە مێژوو بوو مێشـــکم ئاودرابوو بە ناوی کورد و کوردســـتان و پێشمەرگە، کاتێـــک ڕەحمەتی باوکم بۆ براکانمی گێڕابـــووە کە کاتێک بارزانی نەمر لە شـــاری سلێمانی دەست بە ســـەر دەبێ، باوکم ئەوکاتە پێوەندیەکی توندوتۆڵـــی لەگەڵ بارزانی نەمر دروســـت کردوە. لە نێو ئەو دانیشـــتن و کۆبوونەوانـــەی کە بارزانـــی ئامادەی دەبوو لەنێوماڵەکان و شـــوێنە گشـــتیەکاندا، هەر ئەو پێوەندیەش بوو، بووە بە سەرەتایەکی هاوکاری کردنی باوکم بۆ شۆڕش و ڕەنگدانەوەی دایەوە بۆ نێو براکانم، کاتێکیش لە تەمووزی ســـاڵی ١٩٤٣دا بارزانی نەمر بە هاوکاری شـــێخ لەتیف کە مەجیدی قالەی حەمام چی و محەی ســـالە ســـووری لەگەڵدا ناردبوو بۆ بانە لەوێشـــەوە چووبوو بۆ نەغەدە، لەوێوە گەیشتەوە بارزان و دواتر کە شۆڕشی ئەیلولی مەزن هەڵگیرساو ئێمەش وەک بنەماڵەکەمان خۆمان بە سەربازی شۆڕشی کورد زانی لە پێناوی ئەو ڕێگایەدا بەشداریمان کرد.

هەرچەندە زۆر لەسەر شۆڕشی ئەیلول نووسراوە، بەلام من و خەڵکانێکی زۆری تر پێمان وایە شۆڕشی ئەیلول شایەنی زۆر لەوە زیاترە و مەسەلەکە زۆری ژمارەی نووسینەکان نییە بە تەنیا بەڵکو جۆری نووسینیش و وەلامدانەوەی پرسیارە ئەگەرەکانە وەک بۆچی شۆڕشی ئەیلول بەوجۆرە کۆتایی هات؟ نسکۆ وەک ناونیشانێکی گشتی و وەلامی بەس نییە و پێویست بە لێکۆڵینەوەی وردو زانستیانە دەکات. ئایا ئەگەر کەسێکی تر جگە لە بارزانی نەمر سەرکردەی شۆڕش بووایە لە بارزانی باشتری پێ دەکرا؟ لەوانەیە کەم نەبن ئەوانەی کە دەڵێن بەڵێ، بەلام لەڕاستیدا جگە لە قسەو ناونیشانی بە ئەنقەست چەواشەکەرو لە خشتەبەر چ ئەڵتەرناتیفێکی فیعلیان پێ نەبوو، کاتێ پرسیارێکی ڕاستەوخۆ دەکەیتەوە بەگژیانداو دەڵێی ئایا دەتانتوانی بەرەنگاری زلهێزی جیهان و زلهێزی ناوچەکە ببنەوە و شۆڕشتان بگەیانایە ئەنجامێکی باشتر. لەوەلامدا جارێکی تر لە وشەبازی و سەرلێ تێکدان و چەواشەکاری زیاتر چ شتێکی تریان لێ نابیستێ. شۆڕشی ئەیلول هەموو مەرجەکانی سەرکەوتنی تێدا بوو، لەپلان و ئامادەکاری سەرکردایەتی و ورەو گیانی فیداکاری پێشمەرگە، بەلام شۆڕشی ئەیلول هەڵگیرسابوو کەبەرەنگاری ڕژێمی عێراق ببێتەوە نەوەک زلهێزەکانی جیهان. چاوەڕوانکراو نەبوو کە بەوجۆرە ناپاکی لەگەڵ کورد بکرێ و شۆڕشەکەی بکرێتە قوربانی گەمەیەکی نێودەوڵەتی. وتیان دەبووایە سەرکردایەتی شۆڕش ئەو ئەگەرەی لەبەرچاوبگرتایە کە لەوانەیە فێڵی لێ بکرێ. هەموو ئەوانەی وادەڵێن بۆ خۆیان لەناو شۆڕشدا بوون، نە لەسەرەتای شۆڕش و ناوەڕاست و نە هەتا لەکەمێک پێش کۆتایی شۆڕش لێیان نەبیستراوە کە چ پێشبینییەکی زیرەکانەی لەوجۆرەیان بووبێ. هەموو هێرشەکەیان بۆ سەر شۆڕشی ئەیلول بەگشتی و خودی بارزانی نەمر بەتایبەتی دوای نسکۆ دەستی پێکرد. لەخوێندنەوەی ڕاستگۆیانە و دڵسۆزانە بۆ بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد وەک مێژوو

بـــەو دەرئەنجامـــە دەرئەچین کە ئەگەر ســـەرکردایەتی کـــوردو گەلی کورد پێش شۆڕشـــی ئەیلول بشـــیانزانیبایە کە کۆسپی گەورەتر لەوەی چاوەڕوان دەکرێ بۆی هەیە بێتە ڕێیان شۆڕشـــیان هەر هەڵدەگیرساند. لەبیردەکرێ یان دەویســـترێ لەبیر خەڵک ببرێتەوە کە شۆڕشی ئەیلول هەرچەندە نەگەیشـــتە ئەو ئامانجەی کە بۆی دیارکرابوو، بەڵام کۆمەڵێ ئەزموونی بەنرخ و هەندێکیشیان کەم وێنە بوون لە ڕێکخستنی ڕیزەکانی گـــەل، لەبەڕێوەبردن، لەدادپەروەری کە وێنـــەی لە وولاتانی داگیرکەری کوردستانیشدا نەبوو لەخۆڕاگری و گیانبازی و زۆری تریش کە لە ڕاستیدا بەو توانـــا ماددیە کەمەی کە هەبوو مومارەســـەکردنی هەڵســـوڕاندنی کاروبـــاری دەوڵەتێ بوو، بەبێ دروشـــمی بریقەدارو وشـــە ڕازاندنەوە و قســـەکردن، دەنگێکی ڕاســـتگۆی گەورە بوو بە هەموو خاوەن ئەقڵێکی دەگوت کە کورد نەوەک لەباری ئاسایی وخۆشیدا بەڵکو لەباری نائاسایی و ئەوپـــەڕی ناخۆشـــی دا دەتوانێ کاروباری وڵاتی خۆی هەڵســـوڕێنێ بگرە دەســـت ڕەنگینانەتر لەوڵاتی داگیرکەری کوردســـتان و دوژمنانی تر کە بۆ ســـاڵانێکی زۆر وەک جەنگی دەروونـــی و ناو زڕاندنی کورد و بەهانە دروســـتکردن بۆ ئەوەی کورد باشـــتر وایە هەر بە ژێر دەستەیی بمێنێتـــەوە و یـــان کە کورد توانای نییە کاروبـــاری خۆی بەڕێوە ببات. بەکورتی شۆڕشـــی ئەیلول بناغەی پتەو بوو دوای خۆی باوەڕبەخۆبوونی کوردی گەیاندە ئاســـتێکی بەرز لەوەی کـــە دوژمن دەتوانرێ ببەزێنرێ، بهێنێتە ســـەرچۆک. هەروەک ڕژێمی بەعسی هێناو گەمەی نێو دەوڵەتی لێبگەڕایە کوردســـتانی باشوور بەکەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی تریشەوە هەر ئەوکاتە ئازاد دەبوو بەســـەرکردایەتی بارزانی. هەرچەندە پیلانگێڕی دوژمنان دوای شۆڕشـــی ئەیلول بەتینتر بوو دژ بە کورد و هەوڵی زۆری پەرت کردنی کورد دراو بەداخەوە زۆریشیان سەری گرت. پەرتکردنی ئەو دۆســـت و لایەنگرانە لە کورد بکەنەوە و بیشیان خەنە بەرانبەری هێزی ئیحتیاتی و ســـەربازی خۆیان، ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٧٢ لەگەڵ سۆڤیەت

و سۆسیالیســـت خوازاندا بوونه هاو ماڵ و برای باوکی یەکدی لە ســـاڵی ١٩٧٣ لەگـــەڵ حیزبی شـــیوعی عێراقیدا بەرەی نیشـــتمانی و نەتەوەی پێشکەوت و پێکهێناو.

ئامانجی ســـەرەکی لەو هەوڵانەش ڕێگرتن بوو لەلایەن دوژمنانەوە کە شۆڕشێکی ئەیلولی تر بە هەموو بەها بەرزەکانییەوە لەیەک ڕیزی و برایەتی کورد لەتواناو لێزانی لە بەڕێوەبردن و لەدادپەروەری لەبیر ڕەنگینی کورد کە بەردەوام داهێنانی شێوازی نوێ جارێکی تر سەرهەڵنەداتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا شۆڕشی ئەیلول هێشـــتا درەوشاوەترین ئەستێرەیەو زیندوترین نموونەیە لەســـەر توانای کـــورد کە دەتوانێ بگاتـــە دوا ئامانجەکانی و شایەنی ئەوەیە ســـەربەخۆ بێت. لەســـەرەتای هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول من هێشتا گەنج بووم، بەڵام هەواڵەکانی شۆڕش و سەرکردەکەی، بارزانی نەمر ئەو وانە بەردەوامانە بوو، کە لەگەڵیدا گەورە بووم. لەساڵی ١٩٧٣- ١٩٧٤ لەڕێـــگای کاکە خەلیفەی برامەوە بوومە ئەندامی یەکێتی قوتابیانی کوردســـتان شـــان بە شـــانی ئەم بەڕێزانە، عەباسە ڕەش و عەبدولـــی ئەحـــە کەڵەمێرد ( کە بە عەبدولە خڕە ناســـرا بـــوو) و قالە بابیز، کە لە ســـاڵی ١٩٧٤ شەهید بوو، خەباتم دەکرد و سوودێکی زۆرم لەئەزموونی ئـــەو بەڕێزانە وەرگرت لەبواری چالاکـــی خەباتی قوتابیانە لەوکاتەدا کارو چالاکیمان سلێمانی و هەندێ جار دەوروبەریشی دەگرتەوە. بەڕێز کاک کەمال حەســـەن چاومار کە ئەوکاتە بەرپرسی چالاکیەکانمان بـــوو جاربەجار پێوەندی پێوە ئەکردین. لەبەرئەوە دەتوانم بڵێم خەباتی قوتابیانەم سەرەتای بەشداریم بوو لە کوردایەتی دا.

# بەدەم هاواری نیشتیمانەوە پێنج برا بووینە پێشمەرگە

لەگەڵ ئەوەی حکومەتی بەعس پاشگەزبووەوە لەڕێکەوتنامەی ئازار، بەڵام ئەو ڕێکەوتنامەیە هێشـــتا بەدەســـکەوتێکی گەورە و بەڵگەیەکی دیارە لەسەرکاریگەری سەرکردایەتی کورد بە ڕابەری بارزانی نەمر کە بۆ یەکەمین جار بوو لە مێژوودا کە کورد بتوانێ حکومەتێکی عێراقی ناچار بکات کە دان بە مافەکانیدا بنێ بە کوردستانی بوونی کەرکوکیشەوە. گەر سەرشـــێتی و لەخۆبایی بوونی ڕژێمی عێراق نەبووایە و دەستی دەرەکی کە حکومەتی عێراقیان بە گشـــتی و ســـەدام بە تایبەتی فریوودا وایان وێنە کێشـــا کە دان پیانان بە مافەکانی کورد مل دان و سەرشۆڕکردن و بەزینە لە ئاســـتی کورد و سەدامی کەم ئەقڵی بێ ئەزموونی لەخۆباییش کەوتـــە داویانـــەوەو بـــاوەڕی پێکردن کە چـــۆن دەبی ســـوارچاکێکی بلیمەتی وەک ئەو سەرشـــۆڕبکا لەئاســـت، خۆیان وتەنی هەندێ کوردی خێڵەکی و هەندێ هۆکاری تـــر، ئەوە جێبەجێکردنی ڕێکەوتنامەی ئازار دەســـکەوتێکی مەزن دەبوو بۆ کورد و بۆ عەرەب و ئەگەری زۆر هەبوو کـــە زۆرێ لەو کارەســـاتانەی دواتر ڕوویدا ڕێگـــە لەڕوودانیان بگیرایە و ناوچەکە بەگشـــتی جێگیریەکی سیاسی و ئەمنی زۆری بەخۆوە دەدی و بەدڵنیاییەوە بارودۆخی عێراق و کوردســـتان زۆر گەشـــترو پێشکەوتوتر دەبوو، کوردســـتانیش دەکرا کە درێژبوونەوەیەکی ئەمنی و ســـتراتیجی بووایە بۆ گشـــت عەرەب کە بەداخەوە عەرەب بەسەرقاڵ بوونیانەوە بە ڕووکەشەکان هەرگیز نەیانتوانیوە پەی بەنرخی ڕاستەقینەی کوردستانی سەربەخۆ بەرن لەوەی کە خزمەتی گەورە بە بەرژەوەندی نزیک و دووریان دەکات، خزمەتێ کە زۆر زۆر زیاترە لەو هەندە سوودەی کە دژایەتیکردنی کورد بە دەســـتی دەهێنن. ئەمـــە جگە لەوەی کـــە دژایەتیکردنیان بۆ کورد کارەســـاتی گەورەی بۆ دروســـت کردن. ئەگەر جاروبار هەندێ لە ڕۆشنبیرانی عەرەب دەنگی لایەنگریان بۆ مافە نەتەوەییە ڕەواکانی کورد بڵندکردبێتەوە ئەوا عەرەب هەر خۆیان بێ دەنگیان کردووە و تاوانباریان کردووە بەوەی کە خۆفرۆشەو بگرە شعوبی و دژە ئیسلامیش و دەیان ناو و ناتۆرەی لەوجۆرە تاوایان لێ کردووە پاشگەز بێتەوە و جارێکی تر بیر

لەوە نەکاتەوە کە هێڵی ســـوور کە پشتگیریکردنی مافە نەتەوەییەکانی کوردە بەمافی دیاریکردنی چارەنووسیشەوە ببەزێنێ.

دوای پاشگەزبوونەوەی ڕژێمی عێراق لە ڕێکەوتنامەی ئازار و جارێکی تر بەگەڕکەوتنەوەی شـــۆڕش لەهەموو لایەکی کوردستان. ئێمەش پێنج برا وەک ئەرکێکی ئاینی و نەتەوەیی پیرۆز پێوەندیمان کردەوە بە هێزی پێشـــمەرگەی کوردستان. کاکە خەلیفەم لە شـــەڕێکدا بەسوکی بریندار بـــوو. لەلایەکی تر ڕژێم بە هێزێکی زۆرەوە کە جگە لە هێزەکانی پیادە، هێزی تۆپخانەو هێزی ئاسمانیشـــی تیا بەکار هێنرا هێرش دەکاتە سەر ناوچەکانـــی زۆزک و دەوروبـــەری، ئەوکاتە کاکە لەتیفـــم لەگەڵ قالەی حەمە ســـاڵح دەبێ کە فەرماندەی ڕەتڵی زۆزک بووە. لەو شەڕەدا چەند پێشمەرگەیەک شەهید دەبن و هەر لەوێ لە چیای زۆزک دەیانێژن، کاکە لەتیفیشم قاچی دەپەڕێ براپێشمەرگەکانی لە چیاکە دەیهێننە خوارەوە، لەوێ کاک دڵشاد بارزانی بە سەیارەیەکی خۆیان دەینێرێ بۆ میاندواو بۆ چارەسەر دواتر لە میاندواوەوە دەنێردرێ بۆ تاران بۆ چارەسەری زیاتر و لە تاران قاچی دەستکردی بۆ دەکرێ. دواتر کاکە لەتیف پاش چارەسەر دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان بۆ ناو برا پێشمەرگەکانی. شایەنی باسە کاتێ ڕژێمی عێراق پاشگەزبووەوە لە ڕێکەوتنامەی ئازار کاکە لەتیفم ئەفسەری پۆلیس دەبێ لە سەیدســـایەق هەر لەوێوە خۆی و هەموو پۆلیســـەکانی بنکەی پۆلیسی سەیدسایەق بە چەکەکانیانەوە پێوەندی دەکەن بە هێزێ پێشمەرگەی کوردستانەوە.

ناخۆشـــترین ســـاتی چاوەڕواننەکراو ڕوویدا. وتیان شۆڕش کۆتایی پێهێنرا لەوکاتەی کە هێندەی نەمابوو خەونەکان ببێتە ڕاستی. شۆڕشی ئەیلولی مەزن چۆک بەڕژێمی بەعس دابدا، بەڵام جارێکی تر بەعسی گێل لەبری ڕێکەوتن لەگەڵ کوردو داننان بەمافەکانی، بەشێک لە خاک و ئاوی عێراقی بەخشی تەنیا بۆ ئەوەی ڕێگری لە کورد بکات کە خاوەنی خاکی خۆیان بن، بەعس هەمیشـــە وەک ئـــەو دەروون لاوازە وابوون کە هێندە شەیدای هێز بوون کە ئامادە بوون خۆ ڕیسواکەن لەبەردەم هەر بەهێزترێ بەمەرجـــێ بواریان پێ بدا ئەمانیش واتە بەعس ڕۆڵی بەهێز ببینن با لە ڕووبەرێکـــی زۆر بچووکیشـــدا بێت. ئەو ڕووبـــەرە بچووکەش کە بەعس دەوری دەســـەڵاتداری بەهێزی تیا دەبینێ عێراق بوو. کەم ڕژێم هەبووە لـــە مێژوودا هێندەی بەعس زەبروزەنگی لەگەڵ گەلی خۆی بەکارهێنابی، بەڵام لەگەڵ دوژمنە ڕاستەقینەکانی دا هەرگیز هیچی پێ نەکراوە کە چی لەپاش هەموو دۆڕاندنی ســـەرانی بەعس، بەتایبەتی سەدام هیچ شەرمی نەدەکـــرد جار لەدوای جار بڵێ ســـەرکەوتین، زۆریش هەبوو پێی خۆش بوو باوەڕی پێ بکات. ســـەدام و سەرانی بەعس هەرچەندە ئەزموونێکی تاڵی زۆریان هەبوو لەگەڵ کورد بەڵام بەڕاســـتی کوردیان نەدەناســـی، پێیـــان وابوو دەکرێ لەبری کورد بڕیاری چارەنووســـی کورد بدرێ تەنیا لەبەرئەوەی هێزیان هەیە. سەدام بەگرێبەستە ناوزڕاوەکەی ئەل جەزاییر وای دەزانی بۆ هەتا هەتایە کورد لەکار دەخات، وایان وێنە بۆ کێشـــا و باوەڕی کرد. سەدام کوڕی سات بوو لە هەموو گەشتی ژیانی دا دەتوانرێ ئەوە بخوێندرێتەوە کە سەدام هەرگیز توانای ئەوەی نەبووە خۆ بۆ دوارۆژ ئامادە بکات و لە ئەگەرەکان بکۆڵێتەوە، دەیوویست بەهەر نرخێ بێ ئەم کاتەی ئێســـتا تیایدایە بەخۆشی بەرێ بکات، دەم بە پێکەنین تا وێنەی کەسی بەهێزی خاوەن ئیرادە ببەخشێ بە تەماشاکەری. بەڕاستی سەدام وەک کەسایەتی زۆر نزیکتربوو لە ئەکتەرێکی ئەکشن تا سیاسەتمەدارێ خەڵکێکی زۆریش هەبوون بەهەمان ئاواز هەڵسەنگاندنیان بۆ دەکرد بەڵام هەرهێندە بوو لەبری ئەکتەر ناوێکی تریان لێ نابوو کە ئەویش سەرکردەی

مەزنە، بەڕاستی کۆماری عێراقی بەزۆر دامەزراو شانۆگەریەکی خوێناوی درێژخایەنــە کە تەنیا ئەکتەرەکانی عێراقیــن. ئاخۆ ژمارەیان چەند بێ ئەوانەی هەمان عەقلیەتی سەدامیان هەیە و لە هەل دەگەڕێن ببنە خاوەنی بڕیــار لە عێراق دا؟ تا ئێســتا زۆری هەن لە عێراق پێیان خۆشــە وای نیشان بدەن کە زیرەکی و ئازایەتی خۆیان وایکردوە کە عەرەب میللەتی سەردەســتە بێ لە عێراق و کوردیش ژێردەستەو بەهەمان تێڕوانینی خۆ بەبەرزتر زانە وا تەماشای کورد دەکەن. جاری وا هەیە بە شێوەیەک کە دیمەنێکی زۆر گاڵتەجاڕانەیــان دەبێ. لەبیر خۆیان دەبەنەوە کە عێراق لــە بنەڕەتدا دامەزراوێکی بەزۆری دەســتکردی ئینگلیزەو کردنی ئەوان بەباڵادەســت تەنیا بە حوکمی ژمــارە زۆری بوو بە بەراورد لەگەڵ کورد نەوەک هیچ شتێکی تر. بەڵام عەقڵیەتی بەعسی و دەروونی ناتەندروست ئــەو دەروونەی لەقووڵاییدا خۆ بەکەم دەزانــێ لەبەردەم هەر بەهێزترێ و هەمیشــە لەهــەل دەگەڕێ تاوەک خۆقەرەبــوو کردنەوە ئەویش وەک کوێخاکەی ببێتە کوێخا با لەڕووبەرێکی بچووکیشدا بێ. ئەگەر بەزمانێکی ڕاســتەوخۆ بمانەوێ گوزارشــت لەوە بکەین دەڵێین دەسەڵاتی عەرەبی داخــی لاوازی و بــێ توانایی خۆیان لەبــەردەم دوژمنەکانیاندا بە کورد دەڕشــت. ئەوەی دوژمنەکانیان بەوانیان دەکــرد ئەوانیش بە کوردیان دەکرد. زۆر بێ شــەرمانە بەکوردیان دەڕشت و دواتر ناوی بەرژەوەندی نەتەوەی عەرەبیان لێ دەنا. لەبەرئەوەی ســەیر نییە کە عێراقێکی زۆر دەوڵەمەند لە زۆر بواردا بە هێندی وڵاتە زۆر هەژارەکانیشی پێ نەکراوە مەگــەر لە دیکۆرســازی و ڕازاندنەوە نەبێ کەچی هەرخۆیان بەباشــتر دەزانن. بەڕاستی سەدامێک وەک خۆی بووە ڕابردوو بەڵام وەک عەقلیەت بەداخــەوە لەکاتی ئێســتادا هەزاران نموونەی هەیە و شــەیدای ئەوەن بەهەمان ڕێگەکەی ســەدامدا بچنەوە و مێژوو دووبارە بکەنەوە. لەوانەیە وویســتی هەندێکیان وابخوازێ کە بەشــێوازێکی خوێناویتر لە شێوازی سەدام جارێکی دی تێ هەڵبچنەوە. بەڵام هێشتا لە هەل دەگەڕێ.

نســکۆ واتە ڕێگرتن لە تەواوکردنی گەورەترین بینای نیشتمانی کورد

که شۆڕشی ئەیلوول بوو. هەرئەوکاتە زۆریێ لە پێشمەرگە کە متمانەی بێ گومانیان بەخۆو وڵات و گەلی خۆ هەبوو ئەگەر بە دڵێکی برینداریشـــەوە بووبێ دەیانوت جارێکی دی دەســـت پێدەکەینەوە. بەڵام نکۆڵی لەوەش ناکـــرێ کە کاریگەری جەرگ بڕانـــەی ئەو ناپاکیەی لەگەڵ کورد کرا زۆر قووڵ بوو ئەمـــە جگە لەو دەرئەنجامانەی کە لێـــی کەوتەوە. لەوانەش ڕاگواستنی پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلول و خێزانەکانیان بوو بۆ شارو شارۆچکە عەرەبیەکانی باشوری عێراق. ماڵی ئێمەش یەکێ بووین لەوانە. چوار برا بە خێزانیانەوە لەگەڵ من ڕاگوێزراین بۆ باشـــووری عێراق کاکە عوســـمان و کاکە لەتیفم و خۆم بۆ ڕومادی نێردراین کاکە عومەر و کاکە خەلیفەش بۆ کەربەلا. لەو شـــارانەی باشووردا ژیانێکی زۆر سەختی پڕ لە ئازارمان بەســـەر دەبرد، ئەشکەنجەیەکی دەروونی بەردەوام دەدراین. بەندینخانەیەکی گەورە بوو سەرتاپای ژیانمانی گرتبووەوە. لەو شارانەدا ژمارەیەکی زۆر خێزانی عەرەبی هەبوون کە کەســـوکاریان لە شـــەڕی دژ بە کـــوردا کوژرابوون یان کەم ئەندام بووبوون. خەڵکەکە بە گشـــتی و ئەو خێزانانە بەتایبەتی ڕەفتاریان زۆر دوژمنکارانە بوو لەگەڵمان. تەواو وەک دیلی جەنگ مامەڵەیان لەگەڵ دەکردین. لەوێ تەنیا چوون بۆ بازاڕ بۆ کرینی پێویســـتی بۆ خۆی چوونە ناو دۆزەخێ بوو کە هەردەشـــبوو بچووینایـــە. کات نەدەڕۆی لەدڵی خۆتدا هـــەزاران جار بەزەویت دەوت قوتم بدە و چاوەڕێت دەکرد، بەڵام کات نەدەڕۆی. هەموو شتێ دژایەتی دەکردین، هەموو شـــتێ بێ وەڵام بوو. چ شـــتێ نەبوو بۆ تاوێکیش بە ئارەزوی ئێمە بکات. بەڕاســـتی بە جووڵەترین شـــت کە بەردەوام بیری دەخستینەوە کە هێشتا زیندووین هەستی قووڵ بوو بەئازاری جەرگ بڕ، ئـــازاری گیان، ئازاری دەروون. پێش ئـــەم ئەزموونە لە ئەدەبیاتدا زۆرم دەبیســـت لەســـەر باری نێوان ژیان و مردن، مەژی و مەمرە، نەئەژیت و نە ئەمریت لەلام تەنیا وشەبازی بوو، بەڵام ڕۆژگار سەلماندی کە ڕاستە، لەناویادا ژیاین. زۆربەی جار کە بە پێشـــتر بەندکراوێ بڵێی جارێکی تر بەند دەکرێیتـــەوە هەوڵ دەدات، تێ دەکۆشـــێ، هەڵپەدەکاو لنگەفرتێ

دەكا تــا خــۆی دەرباز بكات لەوەی كە جارێكی تــر بەندكرێتەوە بەڵام گـــەر بە ڕزگار بوویەک لە دیلێتی بلێـــی جارێكی تر بەدیل دەبرێی بۆی هەیە زۆربەی جار هەڕەشــە لێكراوەكە مــردن هەڵبژێرێ لەبری دیلێتی.

لەكاتی بوونمان بە باشـــووری عەرەبی زۆر پروپاگەندەمان دەبیســـت كە لەوە دەچوو تەواوكەری ئەو ئەشكەنجە دەروونییە بووبێ كە دەمانچێشت وەک ئەوەی دەوترا هەر كوردێ بەشداری شەڕی كردبێ لەسێدارە دەدرێ یان لە كارگەكاندا دەكرێتە ســـابوون. ئاواتمان دەخواست كە ئەوە ڕاست بووایە. براكانـــم خۆیان زۆر بەكەم تەرخەم دەزانـــی و دەیانوت دەبووا شـــەهید بووینایە. مرۆڤیان نەوتوە لەپێنـــاوی ژیانێک دا كە هەر تەواو دەبێ ئەم ریســـواییە قبووڵ بكات، بەڵام كاتێ تەماشـــای خێزانەكانیان دەكرد و دەشـــیانزانی بەمردن نە كوردو نەكوردستان، برینی نەتەوەیەک ســـاڕێژ نابێ جارێكی تر بڕیاریان دەدا ئارام بگـــرن و زۆر لەخۆبكەن و چاوەڕوانی بەزەیی خوا بن بەمجۆرە دەروون لە گەشـــتێكی پڕ لەئازاری بەردەوام بوو لەنێوان مەرگ و ژیان.

ئەمانەش چەند كەســـێک لەو ئاوارانەن كە لەوێ بوون: دكتۆر نەوزاد ســـاڵح ڕەفعەت، خوالێخۆش بوو عەلی حاجی ســـەعی، كوێخا سمایلی تەلان، مولازم مەنســـوور، حیكمەتی عەبە پاشـــێ، مســـتەفا ســـابیر و سالاری كوڕی، عومەر میراو، خوالێخۆش بوو جەمال عەبدول قادر لەگەڵ ســـەدەها كەســـی تر. ئیتر لەوێ ئەبێت چۆن هەڵبكەیت لەم شارە ئەو كوردانـــەی ئەوێ هەریەكەو لە داییـــرەی مەدەنی دا دایان نابوون. زیاتر فەرمانبەرە عەرەبەكان بەرپرسیاریان بوون. ئەوەی ڕاستی بێ هەندێ لەو عەرەبانەی كە عەشایەر بوون ڕێزیان لەو كوردانە ئەگرت. بەڵام هەندێک لەو پێشمەرگانەی كە گەڕابوونەوە لەوێش لەژێر چاودێری وردی دەزگای ئەمـــن دا بوون. ئیتر ئەوە بـــوو بڕیارم دا كە نەمێنمەوەو بچمە دەرەوە، ببم بە پێشـــمەرگە .هەرچەندە ژیانی پێشمەرگایەتی ئەوكاتە كە ئەمزانی زۆر سەخت و دژوار بوو. بەڵام ئەو ڕێگایەم هەڵبژارد.

پاش ئەو کارەساتە دڵتەزێنەی بە سەر کورد و شۆڕشەکەی هات، لە زستانی ساڵی ١٩٧٦ جارێکی تر بە ئیرادەی کۆڵنەدەری ڕۆڵەکانی کورد و شۆڕشێکی نوێ هەڵگیرسێنرا و هەوڵی بەردەوام و پڕ لە ورە درا بۆ دامەزراندنەوەی ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشارەکان و دووبارە بنیاتنانەوەی هێزی پێشمەرگە. بۆ ئەم مەبەستە پێوەندی کرا بە زۆر لە کەسانی کوردپەروەری ڕۆشنبیر لەناو ئەوانیشدا پێشمەرگە دێرینەکان. وەک هەمیشە خەڵکێکی زۆر بەدەنگ بانگەوازی شۆڕشی نوێوە هاتن. ئەم کارە نیشتمانییە زۆر گرنگ و پیرۆزە ڕاستەوخۆ لەلایەن بەڕێز شاسوار جەلال ئەمین کە بە شەهید ئارام ناسراوە سەرپەرشتی دەکرا.

درەنگانێکی شەو بوو شەهید ئارامیان هێنا بۆ ماڵی ئێمە کە ئەوکاتە ماڵمان لە نزیک سەرقەبرانی گردی جۆگە بوو، زۆر هیلاک و ماندوو دیار بوو. ڕژێم ئەوکاتە بە شوێنیدا ئەگەڕا. سوارەی خوشکەزام و مەلا بەختیار و دلێری سەید مەجید هێنایان بۆ ماڵی ئێمە. ئەو سەردەمانە شۆڕش ئەو ماڵانەی کە هەیبوو بە پەنجەی دەست ئەژمێردران. تەنیا ئەو سێ کەسەو ئازادی ٥٧ ی سەگرمە و سالار عەزیز بوو کە ئەیانتوانی بێن بۆ لای شەهید ئارام. شەهید ئارام کەوتە خۆشاردنەوەو هاتە ماڵی ئێمەو چەند شەوێک لەلامان میوان بوو. دوای ئەوە چووە ماڵی ئەحمەد عارف و گوڵزاری خوشکم، لەوێش چەند شەوێک مایەوە، دواتر بەڕێ کەوت بۆ شوێنێکی نادیار. لەوکاتەدا ئەوەندە هیلاک و ماندوو بووین بۆ شۆڕش کردن، ئەگەر هەرچ هێزێک تەنیا دژی ڕژێم بووایا ئێمە بێ دوودڵی هاوکاریمان ئەکرد ئەگەر بەخوێنی خۆشمان کۆتایی پێ بهاتایە بەخۆمان و هەموو براکانم و خێزانەکەمان ئامادە بووین. بەو هیوایەی کە ئەو بەشداری کردنە ببێتە کەم بوونەوەی ئەو خەفەتەی کە شۆڕش نسکۆی بەسەر هاتبوو. چوونکو عایلەکەمان نیوەی زیاتر لە جنوبی عێراق بوو، بەتایبەتی پیاوێکی ڕاست گۆی وەکو شەهید ئارام شۆڕش دروست بکاتەوە بێگومان بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ڕازی ئەبین چوونکو لەو

سەردەمەدا پیاوانی ڕژێم بەچاوێکی زۆر نزم سەیری میللەتەکەیان ئەکرد وەکو ئەوەی کە گەورەترین ســـەرکەوتنیان بەدەست هێناوە و ئیتر هەر بەعس خاوەن بڕیاری ژیان ئەبێ و کەس بۆی نییە قسە بکات.

شۆڕشـــی نوێ پێوەندیان کرد بە کاکـــە خەلیفەی برامەوە و ئەویش داواکەیانی قبووڵ کرد بۆ بەشداری کردن لە شۆڕشێکی نوێ داو چوونی بۆ ناو چیاکانی کوردســـتان و پێشـــمەرگایەتی بە سەرەتایەکی دروست کردنی مەفرەزە ســـەرەتایەکانی پارتیزانی دەســـتی پێکرد، کاکە لەتیفم لەو سەردەمادا لە شاری ڕومادی بوو لەوێ مولازم ستاری سەعید خەڵف و تالیب ڕۆســـتەم ڕۆژانە باسی ئەو وەزعەی کوردیان ئەکرد ناخۆشی کە بەســـەر کوردا هاتبوو مولازم ســـتار زۆر جار باسی ئەوەی ئەکرد ئەگەر ترووسکاییەک پەیا ببێت ئەچین بۆ دەرەوە، کاکە لەتیفیشم زۆر باوەڕی پێ ئەبێت.ماڵئاوایی لەیەک دەکەن و مولازم ســـتار هاتەوە بۆ سلێمانی، لەوێـــش چاوی بە ســـوارە کەوتبوو لە گەڕەکی حاجی حان لە شـــاری ســـلێمانی لە ماڵی کاک حسێن برای کاک نەبەز لەوێ ئەم بەڕێزانە لەوێ بوون، شـــەهید مولازم ستار، خاڵە نەبەز، خوالێخۆشبوو فازیل شەفیق، شـــەهید کەریم دادە مەنە و فائق شەفیق دوای ئەوەی کۆئەبنەوەو ڕازی ئەبن کە بچنە دەرەوە پرسیاریان لێ کردبوون کە شۆڕش چ ئیمکانییەتێی هەیە بۆ ئەمان شـــەهید ئارام و ســـوارەش پێی وتبوون ئێمە ئاوی ناو ئەوپەرداخەمان بۆ دابین ناکرێت بۆ ئێوە خۆتان ئەبێت مشووری خۆتان بخۆن بۆ هەموو شـــتێک ئەوانیش بەو ڕاســـتگۆییەی ئەوان زۆر دڵخۆش بـــوون، ڕازی بوون کە بچنـــە دەرەوە هەرپێنجیان ڕەوانەی نزیک حاجی مامەن کران، تەها باراوی کەناوی فەقێ عومەر بوو کرا بە رابەر سیاسی ئـــەوان و فەرمانـــدەی مەفرەزە کە ئەوانیش زۆرپێیـــان باش بوو. دوای ماوەیەکی تر شـــەهیدی ســـەرکردە تالیب ڕۆستەم کە زۆر خۆشەویستی کاکە لەتیفم بوو هەر لەمنداڵییەوە ئەویش بەهەمان شێوە لە ڕومادییەوە بەرەوسلێمانی ڕۆیشتەوە و لە سلێمانیش لەگەڵ شەهید شەعبان قلیجەی

کە ناسراوە بە شێخ شەهاب لەوێوە بەرەو چیاکانی کوردستان ڕۆیشتن. هەتا ماوەیەکی زۆر کاکە لەتیفم زۆر غەمبار بوو بۆ ئەوان چوونکو خۆی نەیئەتوانی ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات لەبەرئەوە شەوانە زیاتر بەئازارەوە ئەتلایەوە کە هاوڕێکانی لێ دوور کەوتۆتەوە دوای ئەوە شـــەهید مولازم ئەنـــوەری مەجید ســـوڵتانیش پێوەندی کردبوو ئەویـــش لە ماڵی ئێمە ڕەشـــاش دیمترۆفێکی بەنەوت پاک کردەوە و هەرشەوێ درەنگ ڕۆیشت بەرەو کارێزەوشـــک. دوای ئەوان چەند کەســـێکی تریش هەر بە هەمان شـــێوە چوونە دەرەوە لەوانە تایەری شێخ سدیق لەگەڵ چەند کەسێکی تر.

کاتێک کۆمەڵەی مارکســـی ولینینی کوردســـتان سەری هەڵداو بووە بزووتنەوەیەکی نهێنی ناو خەڵکی ڕۆشـــنبیران و هـــەژاران و کرێکارانی کوردســـتان و ڕێبەرایەتـــی و بزوێنـــەری ئـــەو هێزە بێ لـــە نەهاتوو و ســـەرکردایەتی کردنی لەلایەن شـــەهیدی نەمر شاسوار جەلال ناسراو بە شەهید ئارام*.

هەرکاتێک نووســـراوێکی تایبەتیان هەبووایە بە خەسرەوی برامدا کە بچووکترین منداڵی ماڵەکەمان بوو، ئەو هەڵدەستا بە گەیاندنی، چوونکە بێ شک بوو، شەهید ئارام و مەلا بەختیار و دلێری سەید مەجید پێیان ئەوت تەتەرە بچکۆلەکە،کە ئەوکاتە تەمەنی یانزە ساڵ بوو.

شـــەوێکی تریان کۆمەڵێک پێشمەرگە هاتبوونەوە بۆ ناوشار کە کاکە خەلیفەم و شـــەهید ئەنوەری تۆفیق هەورامی و شەهید عومەری حاجی ئەورەحمانی هێلکەو ئەو پێشمەرگەی ترم نە ئەناسی، نەجمەدینی شێخ قـــادر هات کە ئەوکاتە مفەوەزی نەجدە بوو ســـێ چاکەتی پۆلیســـی و کەلوپەلەکانی بۆ هێنان و بەسەیارەکەی خۆی گواستنییەوە بۆ شوێنێکی

---

*شـــەهید ئارام پیاوێکی زۆر هێمن و لەســـەرخۆ بـــوو. زۆر بەخێرایی وای لێ ئەکردی کە خۆشـــت بووێت. بەداخەوە لە گوندی تەنگیسەر لە ناوچەی قەرەداغ لە کۆتایی مانگی ١ ساڵی ١٩٧٨ شەهید بوو.

تر.

دواتـــر یەکەم بەیانی یەکێتی خوێندکارانی کوردســـتان لە نێومالّی ئێمـــەدا چاپ کراو دواتر بلاّوکرایـــەوە کە تایپ و ڕۆنیۆیان هەموو لەگەلّ خۆیـــان هێنابوو لە مەلابەختیار و دلێری ســـەید مەجیـــد و ئازادی ٥٧ ی ســـەگرمە لەگەلّ سالارعەزیز و سوارەی خوشـــکەزام، بە کاکە خولە ناسرابوو، هەروەها براهیم سەرسپی کە بە بەختیار ناسرابوو.

لە دوای یەکەم بەیان و ئاشـــکراکردنی هێزو توانای شۆڕشـــی نوێ و ئاشـــنابوونی لە نێو خەلّکی کوردســـتان، دواتر چەندین بەیاننامەمان لە نێو چین و توێژی گەنجان و ڕۆشـــنبیران و قوتابیانی نێو قوتابخانەکان بلاّودەکردەوە،بەم کارەشـــمان ڕژێمی ئەوکاتەمان ڕاچلّەکان و پێمان وت کورد نەمردوە و ئاگری شۆڕشێکی نوێ بەڕێوەیە،ڕژێم کەوتە خۆو گەڕان بە دوای بەشـــداربووان لە ڕێکخســـتنە نهێنییەکان،کە هیچ سەرەداوێکی دەست نەدەکەوت بە هۆی هەندێ کاسەلێس و ئەلّقە لەگوێ نەبێ.

دوای ماوەیەک هەردووک شـــەهید ئارام و سوارەی خوشکەزام چوونە دەرەوە. نامەیان بۆ شـــار ئەناردەوە بە شـــەهید حامید یاخســـەمەری، ئێمەش نامەکانمان تەســـلیمی دلێری ســـەید مەجید ئەکرد،ئەم شەهید حامید حەمە ئەمین ناســـرابوو بە (حامید یاخسەمەری) هێندە جوامێر و قارەمان بوو هێزێکی سەربازی گەورە لە گوندی یاخسەمەر چواردەوریان داو گرتیان، لـــەدوای ئەو هەموو ئازارو ئەشـــکەنجەیەی ناو زیندانەکان هیـــچ نهێنێک و ناوی مالّی ئێمەی نەدرکان، ئەوەبوو لە زیندانەوە چەند نامەیەکی نووســـی بوو نموونەی ئازایەتی بوو. لەســـالّی ١٩٧٧ ڕژێم لە بەندینخانەی موســـلّ لە بادوش لە ســـێدارەی دا، هەزاران سلاّو بۆگیانی پاکی حامید یاخسەمەری و گشت شەهیدانی کوردستان کە ناوبراو شەهید چوار خوشکی هەبوو تاقانە بوو.

* کاکـــە خەلیفەم، کە نـــاوی تەواوەتی حەمە شـــەریف بوو لەبەر خۆشەویســـتی و بانگکردنی لەلایەن بنەمالّەکەمانـــەوە ئەم نازناوەی بۆ

خــۆی کــرده نازناوی پێشــمەرگایەتی و زۆر کەس بەم نــاوەوە دەیان ناسی،کە برای گەورەم بوو هەر لەمنداڵیەوە هەست و نەستمان ئاوێتەی یەکتر بووین و بێ یەکترو دووری یەکتر هەڵمان نە ئەکرد، بۆیە زۆربەی کات پێکــەوە بووین تەنانەت بــۆ دۆزینەوەی کاروئیش کردن پێکەوە لە بە دەست خستنی بژێوی ژیان لەڕۆژانەی کرێکاریمان هاوکاری یەکترمان دەکــرد، برایەکــی زۆر جوامێر بوو کە نیشــانەی پیاوەتی و ئازایەتی و دڵســۆزی و کوردایەتی هەر لە منداڵیەوە لە ســیمای جــوان و ڕوونیا دیاربوو تا ئەوکاتەی بووە هەڵگری شــانازینامەی یەکەم پێشــمەرگەی هەڵگیرســێنەرەوەی شۆڕش و بڵێســەنەری یەکەم مەفرزەی سەرەتایی بــوو، ژیان لای ئەم مرۆڤە مەزنــە تەنیا ئازادی بوو بۆ مرۆڤەکان ئەگەر بەگیانی خۆشــی تەواوی بکردایە کە هەر لە ماڵەکەیەوە ڕۆنیۆو تابیعەی لێ بــوو، بەڵکو ماڵەکەی پێگەی ســەرکردەکانی ئــەو کاتە بوو وەک شەهیدی زیندوو ئارام و مەلابەختیارو سوارەی خوشکەزام و دلێری سید مەجید ....هتد لە ماڵی ئێمەوە چەندین نامەو نامە گۆڕینەوەیان ئەکرد، دواتر لەبەر دڵسۆزی ولێهاتوویی و متمانە کردی شۆڕش بەپێویست زانرا کە بچێتە دەرەوە بۆ بەرگری کردن لە ساڵی ١٩٧٦، ئەم برا میهرەبانەم چووە ڕێزی پێشمەرگایەتی .

# ماڵمان بووە ئامانجی پەلاماری ڕژێم ڕاپێچ کردنمان بەرەو بەندیخانە

له مانگی ٨ سـاڵی ١٩٧٦ شـەوێکی درەنگ دوای یەکی شـەو لە زرمەی لێدانی دەرگای دەرەوە بەخەبەرهاتم، هەرکەسەرم هەڵبڕی بینیم سـەربازی ڕژێم ناوەوەی ماڵەکەمانیان تەنیوە، وەک ئەوەی مۆتەکەیەک بێ، چەند جـارێ چاوەکانم هەڵگلۆفی، لە دیواری دەرەوە پەیژەیەکیان شـۆڕکردبووەوە بۆ ناوەوەو لەوێوە هاتبوون و ئینجا سـەربازی ئەوەش بۆ شپرزەکردنی ئێمە بەشەق لەسەریەک لەدەرگاکەیان دەداو هەربەلەقە دەرگای هەیوانەکاشیان شکاند، بەڕاکردن بەرەو ڕووی من هاتن و شریخەی میل ڕاکێشان و هاواری یەک لەدوای یەکی نەجووڵێنەوە، یەکێکیان بانگی لە ئەفسەرەکە کردو وتی: سەیدی گرتمان!

ئەوەی ڕاستی بێ شەوی پێشوو شەهیدان کاکە خەلیفەم و ئەنوەری تۆفیـق هەورامی و عومـەری حاجی عەبدول ڕەحمان و تاهیری شـێخ سـدیق لە ماڵی ئێمە بوون بە کلاشـینکۆفەوە، ئەگەر شەوی پێشوتر بووایە بە دڵنیایی کارەسـاتێکی زۆر ناخـۆش و چاوەڕوان نەکراو ڕووی ئەدا، ئێمە هەموومان تیا ئەچووین چوونکەو ئەو پێشمەرگانە بە ئاسانی خۆیان بەدەسـتەوە نەئەدا لەوانەیە کێشە بۆ هەموو گەڕەکەکە دروست ببووایە. ئەوەی شایەنی باسە لە پرسەی کاکە عەلیم دا بوو، سێ ڕۆژ بوو کۆچی کردبوو. دایکم و خوشـکم و هەموومان ڕەشپۆش بووین. لە دوای گەڕانێکی زۆرو ئەم دویو ئەو دیوکردن و بەسەرایەکدانی هەمووکەرەسەی نێو ماڵەکەمان، خۆشبەختانە هیچ بەڵگەیەکیان نەدۆزییەوە کە سەلماندن بێ لەسـەربوونی ئاشـکراکردنی ئێمەو پێوەندی کردنمان بە شۆڕشـی نوێوە، بۆ دڵنیابوونیان لەو هەواڵەی کەپێیان گەیشتبوو لەلایەن کەسانی خۆیانەوە کە ئێمە هاوکاری شۆڕشین ولە دوای نە دۆزینەوەی هیچ شتێک هەر سـووربوون لەسـەر ئەوەی کە ڕاپێچمان بکەن، یەکسەر دەستیان بەستمەوە، فڕێیان دامە پشتی پیکابەکەوە، کە گەیشتینە ئیستیخبارات لەوێ زانیم دایکیشـم لە گەڵمدا گیراوە، لەوە دەچوو تەنیا هەر ئەو دوو پیکابە نەبووبێ کە دابوویان بەسـەرماندا بۆ ماڵی ئێمە. هەتاوەکو دوو سـەعاتێک کەس گوێی نەدامێ زۆر هیلاک بووم بەحسـاب بەیانی زوو

هەستم بچم بۆ کار کردن. بەیانیەکەی منیان بردو ئەفسەرێک و عەریفێک دانیشـــتبوون. ئەفسەرەکە لێی پرسیم، جەماعەت لە کوێن؟ منیش خۆم لێ گێل کردوو رووم ئەکردە عەریفەکەی تەنیشـــتی وتم (سەیدی وەڵاهی نازانـــم). جارێکی تر رووی تێ کردمـــەوە وتی (موخەڕیبین) رووم کردە عەریفەکەو وتم (سەیدی ئەی تەواو نەبوون موخەڕیبین) کابرای ئەفسەر و ئەوی تر کەوتنە شەق و زلە لێدانم، وتیان خۆت گێل مەکە تۆ تەنزیمی. منیش لە دڵی خۆما وتم ئەگەر قســـەیەکی وام کردبێت لای ڕەفیقەکانم تازە لەسەرم بووە بە ماڵ دەرباز بوونم زۆر زەحمەت، بەڵام بڕیاری خۆمم دابـــوو کە بەرامبەر هەموو تۆمەتێـــک خۆم گێل بکەم، خۆ هیچ لە ماڵی ئێمە نەگیراوە، بۆیە وتم نازانم بۆ لێرەم بۆ ئازارم دەدەن. ئینجا سەرێکی بایاو لە جەڕەســـی داو وتی بیبەن، دوو کەس هاتنە ژوورەوە باڵیان بە توونـــدی گرتم و بردیانم. دوای کاتژمێرێک هاتنەوە ژوورەوە خســـتیانمە سەر مێزێکی بچووک و دەستیان لە پشتەوە بەستمەوە بەرزیان کردمەوە بە زنجیری بنمیچەکەوە هەڵیان واســـیم. بـــەڵام ورەیەکی نوێ کەوتەوە گیانم، مێزەکەی ژێر قاچیان تووڕدا بە بنمیچەکەوە هەڵواســـرام، ئازارو دەردی شـــانەکانم بۆ وەســـف ناکرێ، خەریک بوو هەردوو شانم لەیەک بترازێ، دەمگوت هەر ئێستا هەر دوو قۆڵم لە بندا دەردێت. دەرگاکەیان داخســـت و کەوتنە لێدانم، پێیان دەگوتم کوا ئەو بەیان و نووسراوانەی کە پێت بووە. ئیتر زانیم کە گومانەکەیان زۆر قورسە و قەناعەت ناکەن، مـــن ئەبێت تەحەمولێکی باشـــم هەبێت، من کرێـــکارم و هیچ نازانم. لە دوای بەندکردنـــی من و مانەوەم و ئاگاداربوونـــی مەلابەختیار و دلێری ســـەید مەجید و ئازادی ٥٧ی ســـەگرمە و سالاری عەزیز و لەگەڵ چەند کەســـێکی تر، کە ئەوکاتە ســـەرکردایەتی هەرێمی ناو شـــاری سلێمانی بوون، لە بەندکردنی من کەوتنە خۆشـــاردنەوەو منیش بۆ ڕێ ون کردن و ســـەر لێ شێواندنی ڕژێم کە ئەوکاتە ئەزموونێکی کەمی هەبوو لەگرتن و کوشـــتن، گفتم پێدان وتم دامگرن هەموو شـــتێکتان پێ ئەڵێم. ئێتر پەرداخێک چایان بۆ هێنام و دەست خۆشییان لێ کردم کە هەندێ ناویان

پێ بڵێــم، منیش ناوی هەموو هاوڕێیانی ڕۆژانــەی کارکردنم لەمەیدانی کرێــکاران وت، ڕژێم منـــی هەڵگرت و بە کۆمەڵێــک چەکدارەوە چوارو نیــوی بەیانی چووینە مەیدانی کرێکارەکان و هەموویانیان گرت، هەرچی لێــم نزیک بــوو هەموویانیان ئەو بەیانییە بەندکــران. هەر ئەو بەیانییە زووە هەمــوو هاوڕێیانی کرێکاریمیان هێنا بۆ بەندیخانەی هەواڵگری ڕژێم لە ســلێمانی بــە جلی کرێکاری و کەرەســتەی کارکردنەکانیان لە تاس و کەمچەکانیان،بە پاڵەپەســتۆو ڕاپسکاندنیان بەرەو ژووری بەندیخانە بەڕێ کران، هاوڕێکانم کاتێک ژووری بەندیخانەکەیان بینی هەموویان بە یەک جار تاسان، وتیان ئەمە هاوکاری یەکترکردن بوو کە هەرکەسێکمان کارمان دەســت بکەوێ ئەوانی تر لەگەڵ خۆیان بــەرێ. کاکە گیان تۆ ئێمەت هێناوە بۆ کوێ؟ ئێمە لە چ شتێکداین و چیمان کردووە لە ڕاکردن بە دوای نان زیاتر کە ئەویش ڕۆژێک هەیەو سێ ڕۆژ نییە، من نەمتوانی بە هیچ شــێوەیەک وەڵامیان بدەمەوە لەبەر ئەوەی پاسەوانێک لەگەڵمان بوو قســەکردن لەگەڵ یەکتری یاساغ کردبوو، کەئەوانیش نەیان ئەزانی کەقســەکردن لێدانی تێدایە ومن بەهیچ شیوەیەک وەڵامم نەئەدانەوە،ئەو بەڕێزانە بریتی بوون لە حاجی مشــن،کەماڵە سوور،ئەنوەر عەلی ساڵح و چەند هەڤاڵێکی تر ....

لە دوای بێ دەنگییەکی کەم و خۆر کەوتن لە دوای هەشــت و نیوی بەیانی یەک یەک بانگیان کردن بۆ وەرگرتنی گفتیان، منیشیان دانابوو بە دەست بەستراوی پییان ئەوتن ئەمە ئەناسن و چۆن ئیش پێکەوە ئەکەن لە نێو ریزی ڕێکخســتنە نهێنییەکان،پەیمانتان ئەدەینێ کە ئێوە گفتمان بدەنێ کە ســەرکردەکانتان کێن کە ئێوەیان فێر کردوە دژی ڕژێم کاری تێکدەرانــە بکەن، ئێمە ئێوە ئازاد ئەکەین، ئێمە ئەزانین ئێوە خەڵکانی هەژارن هەڵخەڵەتاوی دەستی ئەوانن، ڕژێمیش بۆیە ئەم وتانەی دەوتەوە بەرامبەر هاوڕێکانم،بۆ ئەوەی ئەوان بڵێن من ڕێکخەریانم، ئەوانیش وتیان بەڵێ ئێمە ئەیناســین و ناوی کەریمەو هاوڕێمانــە کە بەیانیان پێکەوە ئەچیــن بۆ کارکردنی کۆنکرێت کە زۆربەی کات پێکەوەین مەگەر ڕۆژێک

کار نەبێ یان پشووی ڕەسمی بێ یان نەخۆش بین یەکتر نەبینین ئەگینا هەمووکات پێکەوەین .

ئــەم گفت وەرگرتنەی هەموویان ویــەک زمانی هەموویان بۆمن باری گرانی بۆ ســوک کــردم،دوای ئەوەی کە زانییــان و بۆیان دەرکەوت کە ئەوان لەنێو هیچ کارێکی سیاسی کار ناکەن،تەنیا بە دوای بژێوی ژیانی خۆیانــەوەن، ئەویش کرێکارییە، دواتر لە کاتژمێر دەی ســەر لە بەیانی هەمــان ڕۆژ وردە وردە هەموویانیان بەڕێ کردو ئازادکران،کە زانییان و نەیانتوانی هیچ بدرکێنن وهیچ بەڵگەیەک بدەن بەدەســتەوە لەسەر من، هەموو وتەکانیان بوونە پاڵپشــتی گەورەو سوک کردنی بەندیەکەی من و دوای چەند ڕۆژێک منیشــیان ئازاد کرد لەگەڵ دایکم کە لەسەرەتاوە لە ماڵەوە هەردووکمانیان بەندکرد بوو.

ئەوەی شایەنی باسە دلێری سەید مەجید مراقیبی شارەوانی بوو لەگەڵ خوالێخۆش ... ئەحمەد عارفی هاوســەری گوڵزاری خوشــکم. وتبووی کەریم بۆ برنج و فاســۆلیایەک ناوی هەمووومان ئەڵێت. من لەمەودوا زۆر نایــەم بۆ دەوام هەر لە بازاڕەکەیا ئەبم. کاک ئەحمەد عارف پێی وتبوو من کەریم باش ئەناسم لێی مەترسە.

دوای چەند ڕۆژێک شەهید خەسرەو عەبدوڵای حەمەساڵح کە ناسراوە بە خەسرەوی حەمیدی هێنایان لەگەڵ شەهید سمایل قاسم عەلی، شەهید حەمەی قاســم عەلی لەگەڵ عەبدوڵلای حەمە ســاڵح و لەگەڵ کەریمی تەنەکەچی. خەسرەوی حەمیدی و سمایل قاسم حەمەی قاسم دەمانچەیان پێ گیرابوو کێشەکەیانی قورسترکردبوو بۆ ڕزگاربوونیان لەزیندان، دوای چەند ڕۆژێک هەموویانیان لەژێر گوشــاری ئازار وئەشکەنجەیەکی زۆری چەند مانگی، ئەمری لەسێدارەدانیان بۆ دەرچوو، ئەوەبوو ڕژێم ڕەوانەی کردن بۆ بەندینخانەی موسڵ لە بادوش و لە سێدارەی دان. هەزاران سڵاو بۆگیانی پاکی ئەو شەهیدە قارەمانانە. بەندینخانەکانی ڕژێمی ئەوکاتەی شــاری ســلێمانی هەوڵیان دا لەژێر لێدان و ئازار شتێک بدرکێنین، هیچ بەڵگەیەکی ئاشکرایان لەسەرمان نەبوو.

لە مانگی ١٠ ســالّی١٩٧٦، دوای چەند رۆژێــک بەردەوام بوومەوە لەســەر کارکردنی خۆم،بەڵام ئەوەی جێگەی نیگەرانیم بوو کە بەخۆمم زانی هەر لەژێر چاودێری کردنی پیاوانی رژێم بووم و بە دووامدا دەگەڕان، منیش کاتێک بەمەم زانی هەڵسوکەوتی خۆمم گۆڕی بۆ سەرلێشێواندنی ئــەوان من لە دوای ئازادکردنم هەردەم ژیانم ئاســوودە نەبوو کارەکەی خۆم کەکرێکاری بوو بــە ئازادانە نەم ئەتوانی بیکەم، بیرم لەوەکردەوە هەنگاو بنێم بەرەو چیاو ببمە پێشــمەرگە،لەبەر ئــەوەی مەلابەختیارو دلێری سەید مەجیدم ئەناسی منیش هەستام بە خەیاڵی ئەوکاتەی خۆم چوار هاوڕێم کۆکردەوە باســی شــۆڕش و ڕێکخستنەکانم بۆ دەکردن کە ڕژێمێک بەرامبەرمان وەستاوە، ئەگەر ئێمە نەبینە پێشمەرگەو پارێزگاری لەمافی کوردو کوردستان نەکەین وەکو لاوانی ئەم وڵاتە ڕژێم زیاتر خۆی دەسەپێنێ بەســەرخاکی کوردستاندا، ئێمەش هەموو پێکەوە پەیمانمان بەیەکتر دابوو،خوالێخۆشــبوو کاوەی مەحمودی شازەمان ( خوشکەزام)، خوالێخۆشــبوو کامەرانی ئەحمدی شــازەمان و قادری ژن برای مامۆستا عوسمانی سوران.

لــە دوای گفتوپەیمانــی نێوانــی هاوڕێکانم،من چــووم بۆ لای مەلا بەختیار لەگازینۆی شــارەوانی بەرامبــەر جەرجیس،مەلابەختیار لەگەڵ هاوڕێکانــی خەریکی یاری کردنی تاوڵەبــوو، هاوڕێکانی نەیانئەزانی کە ناوی مەلابەختیــارە منیش بانگم کرد کاک مەلا بەختیار کە لە دوورەوە منی بینی زۆر بە خێرایی تاوڵەکەی داخســت و زۆر بە پەلەو بە گورجی هەڵگــەڕا بە کۆڵانەکانی قەزازەکانەوە،دواتــر هەنگاوەکانی خێرا ترکردو بەرەو لای جەمالی قالە قارەمان و کۆڵانی قەزازەکان دەڕۆیشــت، منیش بەدوایدا چووم کە نووسراومان بۆ بکات و بمانێرێ بۆ ناو ڕیزی پێشمەرگە ئەم هەڵهاتنەشی لە دەست من ترسی ناوەکەی بوو کە لەوپێش ڕژێم بە دوای ئــەو ناوەدا دەگەڕا کە من وەک هەرزەکاریش ئەو ناوەم دەرپەڕاند

کە لەوەوپێش من نەمئەزانی کە ناوی حیکمەتە هەربەو ناوەوە دەمناسی کە نەمزانی ئەمە ناوی نهێنییەتی لە دوای ون بوونی لە چاوم و هەست کردنم بە شتێک کە نەیەوێ بمدوێنێ، بۆیە منیش بەدوایدا نەڕۆیشتم، بەلآم حەزو خولیای من و بزواندنی دڵ و دەروونم بۆ ئاواتەکەم کەببمە پێشمەرگە بۆیە بیرم لەوەکردەوە هەنگاو بنێم بەرەو لای کاک دلێری سەید مەجید لە شارەوانی سلێمانی کە یەکترمان بینی و داوام لێکرد نووسراوێکمان بداتێ بۆ خۆم و هاوڕێکانم کە ببینە پێشمەرگە، دوای گفتوگۆیەکی کورت و هێورکردنەوەی من و هاوڕێکانم بۆ ئەو بڕیارەی کە داومانە، ڕێنمایی کردین کە جارێ بۆ ئەوکارە زووە هەر کاتێک شۆڕش پێویستی پێ بوو ئاگادارمان دەکاتەوە،هەر ئێوارەی هەمان ڕۆژ مەلا بەختیار هاتە ماڵەوە ڕێنمای کردم کە جارێکی تر بەو ناوەوە بانگی نەکەم و نەچم بۆ لای. لە دوای بێ ئومێدکردنم بۆ ناو ڕیزی پێشمەرگەو نا ئارامی ژیانم و چاودێری کردنم لەلایەن پیاوانی ڕژێم لەسەرمان، کاکە لەتیفم بردمی بۆ ڕومادی بۆ ئەوەی دەست ڕژێم نەکەوم و تووشی کێشەی بەندکردن نەبم.



بەســـەربردنی ژیان لەرووەمـــادی وەک کوردێکی بەپلـــە زۆر خوارتر تەماشاکراو لەلایەن عەرەبەکانی ئەوێوە، کوردە دوورخراوەکانی کە لەوێ نیشتەجێکرابوون، کەمن یەکێکیان بووم دەگەیاندە ئەو بارە دەروونییەی کە هێندەی نەمابێ بتەقینەوە و قیروســـیا لە هەموو شتێ بکەی، بەڵام کاتێ بیرت لەوە دەکردەوە کە بەتەنیانیت و نواندنی هەر هەڵوێستێکی دژ بەرامبەر بە ڕژێم بۆی هەیە زۆر قورس بکەوێ لەسەر کەسوکارت، کاتێ نەیانتوانایە خۆت دەستگیر بکەن، بگرە زۆرجار گەر خۆشت لە کردەوەیەکی لەوجۆرەدا بکوژرایتایە هەر وازیان لە کەسووکارت نەدەهێنا. ئیتر لەنێوان قبووڵ کردنی ئەو سەرشۆڕیەو بەرەنگاربوونەوەو بەگژاچوونەوەدا دەروون شـــەکەت دەبوو، وەک ئەوەی کەسێک بەبەردەوامی سوکایەتی پێ بکرێ بەڵام قاچ و دەســـت و زمانـــی نەبێ تا چ کاردانەوەیەکی ببێ، ڕاســـتە شـــەڕی ئەعســـابی لەو جۆرە ڕژێم لەگەڵ خەڵکی شـــارە کوردەکانیشدا بە بەردەوامـــی کردوویەتی، بەڵام کاتێ لەناوکوردان بیت، لەناو هاوزمان و هاودەردی خۆت و دەستبەســـەر نەبیت، بـــارت هەردەبێ دڵی خەڵک

بدەیتەوە، خەڵک دڵــت بداتەوە، کەناربگــری و خۆبەدووربگری، بەڵام ئەوەی لە ڕومادی لەگەڵ ئێمە دەکرا زۆر چڕ بوو، بەبەردەوامی بەناچاری ڕووبەڕووی ئەو عەرەبانە دەبوویتەوە. دەمەوێ لەهەڵی ئەم باسە بڵێم کە سەیرنییە کە ئێمەی کورد خاوەنی دروونێکی ئاڵۆزین دەرونێکی هەمیشە لەسەرپێ بۆ بەگژاچوونەوە، هەتا هەندێ جار لەو کاتانەش دا کەپێویستی بەهەڵچوونی دەروونی و کاردانـــەوەی توند نییە. ئەو دەروونە بەردەوام لەســـەرپێیە پشـــکی زۆر لەئەنجامی زۆرداری و نەبینـــی دادپەروەری و بەکەم تەماشاکردنی کەسایەتی تاکی کوردە لەلایەن داگیرکەرانەوە بووە کەبەداخەوە تائێستاش هەر بەردەوامە و کارتێکردنی زۆری هەیە لەسەر ژیانی کوردەواری، پێوەندی خەڵک بەیەکترەوە و کەمبوونی سنگ فراوانی لەگەڵ یەکترو پەلەکردن لەئاراستەکردنی کاردانەوەی توندوتیژ بەرامبەر یەکتر و بـــێ متمانەیی بەهەموو ڕۆژێکی نـــوێ، بەوخەڵکەی لەکۆڵان و سەرشـــەقام و شوێنی کار بەبەردەوامی پێیان دەگەیت. بەداخەوە لایەن و کەســـان هەن لەناو کوردســـتان کەزۆر بێ ویژدانانە ئیســـتقلالی ئەم لایەنەی کەسایەتی کورد دەکەن و بەئاسانی خەڵکانێک هەڵدەخەڵەتێنن بەتایبەتـــی خەڵکانی مێردمناڵ وگەنـــج و لاوی کەم ئەزموونی دەکەنەوە بەگژ هەرشتێ کە مەبەستیانە، لەبری چارەسەرکردنی، شەیتانانە سوودی لێ وەردەگرن بۆ بەرژەوەندی خۆیان.

هەروەها ئەوەی هەستی پێ دەکرا ئەوە بوو کە شێوازی ڕژێمی عێراق لەدوای نســـکۆ لەئەشکەنجەدان و جەنگی دەروونی و شەڕی ئەعساب کە دژ بەکورد ئەنجامیان دەدا زۆر چڕتر بوو لەو شێوازەی کەپێش و لەکاتی شۆڕشی ئەیلولدا ئەنجام دەدرا، لەبەرئەوەی کە چڕکردنەوەی شێوازەکەو بەکارهێنانی زۆر شـــێوازی دیکەی نوێ تاڕادەیەکی زۆر بەخێرایی ڕوویدا وامـــان لێدەکات کە بڵێین کە ڕژێمی بەعس یارمەتیدەرو فێرکەری هەبوو لـــە دوژمنایەتیکردنـــی کورد. بەمجۆرە بوو ژیان لەڕوومادی و شـــێوەی بیرکردنـــەوە و باری دەروونیان هەربۆیـــە ڕۆژێ لەڕوومادی هەڵاتم بەرەو سلێمانی، کەنزیک سلێمانی بوومەوە سەرەتای باڵکێشانی هەتاوبوو بەڵام

بەناو چینیَ تەمەوە وەک ئەســـتێرانی شەو تیشکی خۆر جریوەی دەکرد ببووە سەرپۆشـــێکی بریقەدار بەسەر ســـلێمانییەوە، وەک میوانێکی زۆر خۆشەویستی هەمیشە حەزپێکراو بیَ لەدەرگادان خۆی دەکرد بەقوولایی دەروونـــدا و دەیهەژاند، بـــۆ تاویَک لەبیری بردمـــەوە کەمن هەلاتووم و ژیانم لەمەترســـی دایە، کە بەئاگاهاتمەوە بیرم کەوتەوە هەرچەندە کوڕو پێشمەرگەی ئەم سەرپۆش لەسەرم بەلام دیلم تیایدا، غەریبم.

شەو لەگەڵ دایکم دانیشتم نەمدەزانی چۆن ئەو گەردەلوولەی دەروونی بۆبکەمە شـــنەبایەک تا قبوولّی بکاو ئازاری تر نەخەمە پاڵ ئازارەکانی دەمویســـت پێی بڵێم کە من دواکەســـیش نابم جێهێشتنی ئەو بەتەنیا قبـــووڵ بکەم، بەلام لەهەمان کاتیشـــدا بریارم ئەوەبـــوو کەجێی بهێڵم! بگەڕێمـــەوە ئەو تاکە ماڵ و ســـەنگەرەی کەتیایـــدا کۆیلەنیم و لەوەش زیاتـــر لەگەڵ زۆریَ لە ڕۆڵەکانی ئەم ولاتە هەرچیمان پێکرا دەیکەین بۆ نەهێشتنی کۆیلەی و ئازادکردنی مرۆڤی کورد لەژێردەستەیی، باوەرناکەم ئەوکاتەو ئێســـتاش دوای خواپەرستی کاریَک بووبیَ و هەبیَ پیرۆزتربێت لە کارو خەبات لەپێناوی ڕزگارکردنی خاک و نەتەوە لەژێردەستەیی.

ژیان فێری کردم کە مرۆڤ هەرچەندە خۆی بەســـەربەخۆ و بڕیاردەر بزانیَ، خۆی بەهەرچی بزانیَ، دواتر بۆی دەرئەکەویَ کە ئەوەی بەڕاستی ڕوودەدات لەژیانی هەرکەســـێکمان ئەوەیە کە دروســـتکەری بڕیارەکانی کـــە دەیدەین نیـــن بەڵکو لەچەندینـــا گونجاوترینی کەلەبەردەســـتدایە هەڵدەبژێریـــن، جاری واش هەیە بەئازاریَکی دەروونی قووڵ و هەســـتا بە تاوانکردنەوە بڕیاریَ دەدەین لەبەرئەوەی لەوە باشترمان پیَ نەکرا، پشت لەخۆشەویســـترین دەکەی، واتە لەناچاری دا ڕەفتـــاری دژ بەو بڕیارە دەکەین کە بەئاواتەوە بوویت بتوانیبایە بیدەی.

دایکـــم لەتەنیشـــت قۆریەچای دەمکـــراوەوە دانیشـــتبوو، تەزبیحە سەدویەک دەنکیەکەی بەدەستەوە و بەردەوام لیێی دەڕوانیم وەک ئەوەی بـــۆ ماوەیەکی زۆر لیێی ون بووم و ئێســـتا شـــادو ئاســـوودە بووەتەوە بەدۆزینـــەوەم. وتی ڕۆڵە کەی دەگەڕێیتەوە بۆ ڕوومادی؟ کە تەماشـــام

دەکـــرد چەندە دڵخۆشــــە بەمن نەمدەوێرا ڕاســـتەوخۆ پێـــی بڵێم، وتم نازانم، ...لەوانەیـــە هەرنەڕۆمەوە هەرخێرا دەنگی گۆڕاو وتی ڕۆڵە چۆن شـــتی وا دەکەیت.... ئەگەر نەچینەوە. زوو پێم بڕی، دەمویست هەرچی زووە ڕاســـتیەکەی پێ بڵێم، وتم دایە چیتـــر بەرگەی ئەو دەربەدەری و سەرشـــۆڕیە ناگرم، ناتوانم. دایکی داماو تەواو ڕەنگی زەرد بوو، لێوانی دەلەرزین و لە پڕبوونی قورگی بە ئاستەم قسەی بۆ دەکرا. کە سەرنجی ئەم سەرچاوەی سۆزەم دەدا بەتەمەنی شەست و حەوت ساڵیەوە جارێکی تر گیانی ڕاچڵەکی وام هەســـت دەکرد کە هێندە تاوانبارم هەرگیز ڕۆژێ نایەت هەست بە ئاسوودەیی بکەم، بەڵام لەوە باشترم پێ نەکرا. هەوڵم دەدا کە دایکیشـــم وەک من هەست بکات کە بەڕاستی ناچارم، وتم دایە گەر نەگەڕێمەوە شـــاخ دەســـتگیر دەکرێم و دەکوژرێم، وتی ڕۆڵە ناکرێ ماوەیەکی تر بڕۆی، بەهەناسەســـاردی پەروەردەم کردی، ئاوا پاداشتی ماندووبوونـــم دەدەیتەوە. دایە گیـــان هیچ چارێکم نییە دەبێ بڕۆم. وتی یەعنی ئەبیتە پێشمەرگە، وتم بەڵێ هەردەبێ بچم، نازانم دەتبینمەوە یان نا، گەردنم ئازاکە، بەیانی ماڵئاوایم لەدایکم کرد.

چووم بـــۆ گوندی خەمزە. منیش بڕیارم دا بچم بۆ هەرێمی شـــەش بۆلای تالیب ڕۆســـتم کە بە شێخ تالیب ناســـراوبوو،لە ڕێگای ماوەتەوە سەربازگەیەکی پڕ لە سەرباز چواردەوریان گرتم و بەندیان کردم و بردیانم بۆ ماوەت، پێناســـەی سەندیکای ڕومادیم نیشان دان کە وتم هاتووم لەم ڕێگایەوە هەندێ شـــتومەکی ئێرانی بکڕم بـــۆ هاوڕێکانم، بە بەندکراوی لەماوەتەوە گواســـتمیانەوە بۆ ئەمنـــی چوارتا بەڵام خۆش بەختانە هیچ بەڵگەیەکیان لەســـەرم نەبوو لە ئەمنی چوارتا وتم من لەماڵی مستەفای کوێخا قادرم و ئەوان خزمن لەگەڵ ئەوەشدا برایەکم، کە پێش مانگێک لە ڕومادی خۆی خانەنشین کردبوو، لەخەتی چوارتا و سلێمانی کاری دەکرد بەناوی عوسمان عەبدوڵڵا مارف ئەم ناوانە لای ئەوان ناسراوبوون، ماڵی مســـتەفای کوێخا قادر وەک کەســـایەتی ناسراوی چوارتاو کاکیشم وەک کاکە عوســـمان زۆربەی کات ئەوخەڵکانەی ئەوێ و سەربازو پۆلیسەکانی

هاتووچـــۆ پێ ئەکرد لەو بەینـــەدا چوارتاو ســـلێمانی، لەبەر ئەم هۆیە ناردیانم کە لەماڵی مســـتەفای کوێخا قادر بخەوم و بەیانی چوومەوە بۆ دائیرەی ئەمن. لە دوای چەندکاتژمێرێک کاکە عوسمان هات بۆ ئەوێ کە ئەمنەکان ئاگاداریان کردبوو یەک دوو زلەی لێدام و ســـەر زەنشتی کردم کە بۆ هاتووم بۆ ئەم ناوە، دواتر بە کەفالەتی ١٠٠ دینار ئازادیان کردم و لەگەڵ کاکمدا چوومەوە بۆ سلێمانی ئەو شەوە لەماڵی خۆمان مامەوە.

بەیانـــی زوو چـــووم بـــەرەو قـــەڵادزێ لەوێش دوای وڵاخـــدارەکان کەوتم،چووم بەرەو شـــێنێ و نۆکان لەوێ دلێری سەید مەجید و زیرۆی عەبە رێویم بینی کە پاسەوانی مام جەلال بوون دوای چەند ڕۆژێ تالیب ڕۆستم هاتەوە لە مەفرەزە کردن و منیش بووم بە پێشمەرگە لە هەرێمی شەش لەکۆتایی ساڵی١٩٧٧. ئەوکاتە هەستم بە ئازادی کردو لە چیاکانم ڕوانی کەی بێ گەلی کوردیش وەکو پێشمەرگە هەوای ئازادی و دوور لە چەوسانەوەی دوژمن هەڵمژن.

دوای چەنــد ڕۆژێ چوومە بارەگای هەرێم لە گۆڕە شــێر دوای چەند هەفتەیەک ڕژێم هێرشــێکی بەربــڵاوی کرد بۆ ســوتاندنی دێهاتەکانی کوردستان، ڕاگوێزانی سەرسنوور بەقووڵایی بیست کیلۆمەتر.

ڕاگوێزانی کورد لەســەر زەمینی باوباپیرانی خــۆی جگە لەوەی کە سیاسەتێکی ڕەگەز پەرستانەی دژی مرۆڤایەتیە، هەنگاوێکشە بۆ پەرت و بــڵاو کردنەوە و تواندنەوەی ئــەو کوردانەی ڕاتەگوێزرێن چوونکە ئەم خێزانە کوردانەی دوور ئەخرێنەوە بێبەش ئەکرێن لە پیشــەی هەمیشەی خۆیان لە ژیانیان، لەسەر بووە کشتوکاڵ و پەروەردە کردنی ئاژەڵ. ئەمە وایان لێ ئەکات کە ئیتر نەتوانن خۆیان بەخێوبکەن و چاویان لەدەستی ڕژێم ی بەغدا بێ، بە تایبەتی لە ئۆردوگا زۆرەملیەکاندا هیچ پیشەیەکی تیــا نییە. لەم بێ کاریەی ئۆردوگاکانــدا ناچار ببن بچن بۆ کارکردن بۆ خواروی عێراق بۆ نان پەیدا کردن. ئەمەش ئەبێتە توانەوەی کورد لە ناو عەرەبی ناوەڕاست و خوارووی عێراق دا.

ڕژێمــی عێراق بــە ملیۆنەها دیناری ســەرف کرد بۆ ئــەو ئۆردوگا زۆرەملیانە. ڕاگواســتنیش زەرەرێکی گەورە بوو لە کشتوکاڵ و سامانی ئــاژەڵ، ئەمەش گیروگرفتی ئابووری لێ کەوتەوە، بە تایبەتی کێشــەی لە زۆر ڕووەوە بۆ کوردســتان دروست ئەکرد. پاش داگیرکردنی ناوچەکە دانیشــتووانی گونــدەکان ئەگیرێن و بەخۆیان و هەندێــک کەلو پەل و ئاژەڵــەوە ڕاپێچ ئەکرێن ئەپەســتیرێنە ناو چەند زیلێکی ســەربازیەوە، ئەگوێزرێنــەوە بۆ ئۆردوگا زۆرەملێیانەی کە پێشــتر ئامادە کراوە بەبێ کارەباو ئاو دایانئەنان. لەکاتی گواســتنەوەیاندا بەســەدەها پیرو منداڵ و، منداڵی شــیرەخۆرە مردن، بەتایبەتی لە ئۆردوگاکانی تووە سوران و بەستەســتێن لەناوچەی پشدەر، خانوو مزگەوت و قوتابخانەو باخ و ڕەز و کانیاو ئەســوتێندراو کاول ئەکران لەگەڵ خاکدا ئەیانکردن بە یەکو بە نرخێکی زۆر هەرزان مەڕوماڵات لــێ وەرئەگرتن. دوای چەند هەفتەیەک ڕژێم دیســانەوە ئەو ناوچەیەی کە لە ســنورەوە نزیک بووە، هێرشێکی بەربڵاوی بۆ هەندێک لە دێهاتەکان کرد، تا ســەر سنوور. ئێمە ئەو کاتە

به شـــاخەکانەوە بوویـــن، بەڵام بەرگریەکی ئەوتۆمان پـــێ نەئەکرا، کە ڕێـــگای لێ بگرین و نەهێڵین بگوێزرێنەوە، سیاســـەتێکی وردو پلانڕێژی بەعس بوو، کە ئاســـەواری ئەنجامی گەلێ ترســـناکیان لێ ئەکەوتەوە. ڕاگوێزان جگە لە هەوڵدان بۆ دابڕکردنی هێزی پێشمەرگە و ئابڵوقەدانی بزوتنـــەوە چەکداریەکـــە پلانێک بـــوو بۆ کۆنترۆڵ کردنـــی هێزی زۆری جوتیاران کە بزوێنەرو دینامۆی شۆڕش و پێشمەرگە بوون. گواستنەوەی هێزێکـــی تاکتیفی بەهەرمێن بۆ هێزێکی بێکاری مشـــەخۆر لە ئۆردوگاو شـــارەکاندا. ئەم هەموو هۆیانە خەڵکی گوندەکان بێ ئەوەی بەرگرییەک نیشـــان بدەن دەیان خستنە نێو زیلی سەربازیەوە بۆ ئۆردوگاکان دەبران دوژمـــن نەک هەرگونـــدەکان بگرە تـــەواوی باخ و بێســـتان و پاوان و مەزراکانیشی گڕی تێ بەردان ئەمە ناوی هەندێ لەگوندەکانە: بێ دەلان، ئاڵی ڕەش مارە دوو، ڕەزڵە وتوتمە و ســـونییەو بەسەدەها دێهاتی تری ناوچەکە ئەوەی ڕاســـتی بێ ئەو سەردەمە کوردستان تام وبۆنی مەرگی گرتبوو لەتەقینەوەی هەرگوندێک و هەربەردێک. لەو دۆزەخەی بەعســـدا دەســـووتاین و دەژیاینەوە،چەند ڕۆژێکی مەرگ ئاسا بوو. ئێمە زیاتر ڕق ئەســـتوورتر دەبووین. داخەکەم ئەو ڕۆژانە بەعس لە هەوڵی سڕینەوەی ئێمەداو ئێمەش لەهەوڵی بڕینەوەی یەکتردا بووین. سیاسەتی لەناوبردنی ئیلغابونی نەتەوایەتی و بوونی کوردیان گرتۆتە بەر بەڵکو شـــەڕی ئێمەو بەعسییان دەگەڕێتەوە بۆساڵی ١٩٤٧ کە بەعس نزیک دەکات و شەڕەکە لەو ماددەیەوە دەست پێ دەکات کە دەڵێ سنوری نیشتمانی عەرەب لە ئۆقیانووســـەوە درێژ دەبێتەوە تا دیوی ئەودیوی چیاکانی پشـــکۆ، واتە ئەوان نەک تەنیا کوردســـتانی باشـــوور بە وڵاتی عەرەب دەزانن بەڵکو بەشـــێکی زۆر کوردســـتانی ڕۆژ هەڵاتیش بە عەرەبستان ئەزانێت، هەتا کۆنگـــرەش بۆی نیە ئـــەو ماددەیە بگۆڕێت. بزانن چـــۆن بەعس چاوی بڕیوەتە کوردســـتان. نامەوێت قەتماغەی برینەکان هەڵدەمەوە بۆ تانەو تەشەرو مەبەســـت لە بەخۆدا چوونەوە و بەرچاوخستنی شۆڕشگێڕانەو پەنـــد و عیبرەت وەرگرتنە لە مێـــژوو و هەڵەکانی خۆمان بۆ ئەوەی کە

دوێنێمان لەدەســـت چوو ئەمڕۆ و سبەینێشمان لە دەست نەدەین، کۆنە چاڵـــی تاقیکراوە نەکوتینەوە و بۆ ئەوەشـــە لە دوژمنـــی کورد بگەین بەتایبەتـــی بۆ ئێمەی کورد نەک هەر لە باشـــوری کوردســـتاندا بەڵکو لە هەموو بەش و پارچەیەکی دیکەشـــدا. مەســـەلەکە مەسەلەی مان و نەمانـــە لەگەڵ دوژمنانی کوردا ئەگەر دوژمن وەکو هەیە تێبگەین ئەبێت لەهەموو کاتێکدا زۆر یەکگرتوو بین. بەلای منەوە بە کورتی ئەرکی هەرە زۆری لەناوبردنـــی کورد بووە بەهەر نرخێک بێت. ئەگەر ئێمە بەخۆماندا نەچینەوە ئەو خاڵانەی ســـەرەوە بەس نین و خوا بەشـــارەتی لێنەبڕین و بۆ ئەوەی مشتومڕێکی نامەســـئولانە نەبڕینەوە هەر ئەوانەی سەرەوە بەسن بۆ زیاتر لە بەعس گەیشتن و مەترسی ئەو ڕژێمەو داگیرکەرانی تر پێشـــاندانی چەند نموونەیەکی بەعس بەسەر کوردو کوردستانیدا هێناوە پەردە هەڵدانەوەیە لەســـەر ئەو بەرنامەیەی بۆیـــان داناوین واچاکە ئەو جەهەنەمەی سازاندویانە بەدەرخەین.

شەهیدی ســـەرکردە تالیب ڕۆســـتەم ئاگاداری کردین و وتی دەبێ دەســـتێکی باش لە دوژمن بووەشـــێنین، دوژمن هاتە دێی ئاڵی ڕەش و ئێمەش بەڕێکەوتین، شـــەهید تالیب ڕۆستم فەرماندەی هەرێمی شەش و ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان لە نەخشەیەکی دیاریکراودا دووپێشمەرگەی ناردە پشتی ئالی ڕەش و سمەی مەلا عەبدول و محەمەد خدر، ئێمەشـــی دانا لە خـــوارەوە لە نێودارەکاندا کە نزیکەی بیست و پێنج کەسێک دەبووین.

بۆ ئەوەی ڕژێم و ســـەربازەکان بەرەو ئەو دوو پێشـــمەرگەیە بڕوات، ئێمەش لە خوارەوە دەســـتێکی باشـــیان لێ بووەشـــێنین هێزوبازووی پێشمەرگەیان نیشـــان بدەین لەتۆڵەی خاپوورکردنی دێهاتەکان،لە دوای شـــەڕوپێکدادانی هـــەردوولا ئێمەبێ زیان دەرچووین بـــەڵام ئەوان چەند کوژراوێکیان هەبوو یەکێ لەوتەرمانە دەســـت پێشمەرگە کەوت و ڕۆژی دوایی ئەوە بە کوێخاکەدا کوێخا خدری شـــێنێ تەرمەکەمان ناردەوە بۆ نێو سەربازگەی سونییە، هەر هەمان شەو لە ئاشەکەی ئاڵی ڕەش هەشت

کەسیان هەڵبژارد من و خدر زۆری و محەمەد خدر و جەمالی خاوەو چوار پێشمەرگەی تر کە هێرش بکەینە سەرسەربازگەو زۆر بەچاکی لێمان دان و چووینە ناو سەربازگەکەوە کە زیاتر لە نیو کاتژمێر بەرگرییان لەخۆیان دەکـــرد و دواتر ئێمە بێ زیان گەڕاینەوە نێو بارەگاکانی خۆمان. ئەوەی شایەنی باسە کاکە خەلیفەم و شەهید ئەنوەری تۆفیق هەورامی و تاهیری شــێخ ســدیق ( ناســراوە بە فەتاح) چەندین جار هاتبونەوە ناو شاری ســلێمانی بۆ چالاکی کردن، هەموو کاتێک ســەرکەوتوو بوون بەڵام ئەم جارەیان ئەکەونە بۆســـەی دوژمنەوە لە گەڕەکی سەرچیمەن لەئەنجامدا شـــەهید ئەنوەری تۆفیق هەورامی و تاهیری شـــێخ سدیق بریندار ئەبن دوو تفەنگ لە دوژمن ئەگرن و تەکســـیەک پەیدا ئەکەن و پێی دەرئەچن بۆ گەڕەکی بەرامبەر ئیســـکان، دوور تەکســـیەکە دائەنێن و خۆیان زۆر بەزەحمـــەت ئەچن بۆ بینایەکی تازە دروســـت کراوە کـــە تەنها ژووری حەرەســـەکەی لێیـــەو لەگەڵ بلۆک و چیمەنتۆ و شـــیش. ئەچنە ژووری حەرەسەکە کە ناوی خوالێخۆشبوو مام ڕۆستەم بوو باوکی برازنە نەزیرم. کە خوالێخۆشـــبوو مام ڕۆستەم بەو شـــێوەیە دوو بریندار بە تفەنگەوە ئەبینێت زۆر تێک ئەچێ و شـــپرزە ئەبێت. کاکە خەلیفەم ماچی ئەکات و ئەڵێت مام ڕۆســـتەم کەس ئێمەی نەدیوە مام ڕۆســـتەمیش پیاوێکی زۆر بە بەزەیی بوو، ئەچێت هەندێ شـــتی پێویستان بۆ ئەهێنێ و ئەڵێ کوڕەکانـــم خۆتان حەرەس بـــن لە بیناکە ئەمانیش ئەڵێـــن تەنها تاکو ڕۆژ ئەبێتەوە دوای خۆمان ئەڕۆین. خوالێخۆشـــبوو مام ڕۆستەم ئەڕوات کاکـــە خەلیفەم ئەبینێت خوێنیـــان زۆر لێ ئەڕوات تفەنگەکەی دائەنێ و ئەچێت پەرستاریان بۆ بێنێت، ئەچێت بۆ چەند ماڵێک پەرستاری دەست ناکەوێت. ئەو شـــەوەش شار شـــڵەژاوە لەبەر ئەوەی دوو کەس لە ڕژێم کوژراوە لەو ســـەردەمەدا دوو کەس زۆر ئەبێت بۆ ڕژێم. قوات خاســـەو ئەمن هەموویان لەئینزاردا ئەبن ئەگەڕێن بۆ ئەو پێشـــمەرگانە ئەزانن کە برینداریان هەیە. ئەمانیش لەو شوێنی حەرەسە باشتریان دەست نەکەوتوە بۆیا لەوێ ماونەتەوە. کاک خەلیفەم لە ئیسکانی تازە چواردەوری ئەگرن

و هەوڵ ئەدات بەســـەربان و ماڵەکاندا دەرباز بێت، بەڵەم هیچ چەکیشی پێ نابێت لەو جێگایەی شـــەهید ئەنوەر و تاهیری شێخ سدیق زۆر دوور ئەکەوێتەوە ئەگیرێ دوای ئەوەی بەڵێدانێکی زۆر ئەیبەن، ئیســـتیخبارات زۆر دڵ خـــۆش دەبن پێی ئەڵێن تۆ موخەڕیبی ئەویش ئەڵێت موخەڕیبی چی من پۆلیســـم فیرارم، ئەڵێن تۆ خەلیفەی ئەویش ئەڵێت ئەوە نفوس ئەگەر ناوم خەلیفە بوو حەقی خۆتانە ئەڵێن ئەی بۆ ڕات کرد ئەڵێت من پۆلیسم لە کەربەلا بۆم ناکرێ و ناچم بۆ ئەوێ. دیارە بەگوێیاندا ناچێت و ئەوان هەر ئەڵێن تۆ موخەڕیبیشـــی و ناویشـــت خەلیفەیە ئەویش هەر ئەڵێت نە موخەڕیب و نە ناویشـــم خەلیفەیە من زۆربەی کات لە ئیسکان سەرخۆشم. ئەگەر لەسەر نفوسەکەم خەلیفە نوسرابوو ئەوە ئێوە ڕاست ئەکەن، بەڵام گەورەم ئێوە تەنها پۆلیسێکی فیرارتان گرتووە. ئێستا من لە مەعمەلی دۆشاوی تەماتە کار ئەکەم لە کەربەلا لە پۆلیسیش دەریان کردووم. ئیتر دوای ماوەی مانگێک زیاتر ناردیان بۆ مەرکەزی شـــورتەی سەرشـــەقام بە کەفالەتی (١٥٠) دینار ئەوکاتـــە ئەینێرنەوە بۆ کەربەلا بەزیندانی لەوێش هیچی لەسەر نابێت ئازادی ئەکەن.

دوای ئـــەوەی ئەو شـــەوە بـــۆ بەیانیەکەی تاهیری شـــێخ ســـدیق خوالێخۆشـــبوو مام ڕۆســـتەم ئەنێرێت بۆ یارمەتی بۆ لای باوکی شـــێخ ســـدیق ئاگادار ئەکات. شێخ سدیق کوڕەکەی و سەیارەیەک ئەنێرێت بۆ ئەو جێگایەی کە شـــەهید ئەنوەر و تاهیری شـــێخ سدیقی لێیە، ئەیان گوێزنـــەوە بۆ ژێرزەمینەکەی خۆیان تاکو تۆزێک چاک ئەبنەوە ئینجا بە تراکتۆرێک خۆیـــان و چەکەکانیان لە دۆڵەڕوتەوە ئەنێرێتەوە بۆ دەرەوە بۆ گوندی چۆغماغ لەو ناوچەیە شوێنی عاسی لێیە ئەشکەوت و شوێنی شاردنەوەی زۆرە لەوێ ماوەیەک ئەمێننەوە.

بـــەڵام زۆر بەداخەوە ئازادی تۆفیق هەورامی کە برابچوکی شـــەهید ئەنوەرە ماوەیەک تووشـــی نەخۆشی نەفســـی ئەبێت لە دووری دایک و باوک و خوشـــک و براکانی لە سەر ئەوان لە زیندانی سەماوە گیرابوون. لە کاتی دەمەبۆڵەدا یەک ســـەلی کلاشینکۆف ئەنێت بە شەهید ئەنوەری

برایەوە هەر لەویا ئەیکوژێ و ئەچێتە ســەر دارێک دائەنیشــێت و دوای ئەوەی کە تاهیری شــێخ سدیق بە سەلیقەی خۆی ئەهونەی ئەکاتەوە و داوای لە ئەکات کە بێتە خوارەوە و ئەمە شتێکی خۆتانەو هیچ پەیوەندی بــە ئەوەوە نیە، بەم جۆرە تفەنگەکەی لــێ وەرئەگرێت و زۆر ئەهونەی ئەکاتــەوە دوای چەند ڕۆژێک ســالار عەزیز گولە بارانی ئەکات و مەیتی ئەو دوو قارەمانە ئەنێرێتەوە بۆ ســلێمانی کە دائیرەی ئەمن سەیرئەکات کــە ئەوانن دوای ئەوە دایک و خوشــک و براکانیــان بەردابوون. دایکی زۆر غەمبــار ئەبێت بۆ کوڕەکانی ووتبــووی کەوەک و ئەنوەرم کوژرا بۆ ئازادی کووڕمتان کوشــتوە یان بۆ جوابتان بۆ نەناردین بۆ زیندان بتان زانیایە ئێمە ڕازی ئەبین یان نا. بەڕاستی ئەو ڕۆژانە هەتا بڵێی ڕۆژانێکی بێکەسی بوو ئازاری ئەو ڕۆژانە هەروا زوو تەواو نابێت.

کە لە کەربەلا کاکە خەلیفەم بەر ئەدەن و ئەچێتەوە بۆ مەعمەل دوای چەند ڕۆژێک ترســی گرتنی ئەبێت، ئەچێتەوە بۆ دەرەوە لەوێ ســالار عەزیز ئەبینێت و وەزعەکەی تێ ئەگەیەنێت و لەناوشاریش تەنزیم پێیان ووتــووە بچۆرەوە دەرەوە تۆ بەغەڵەت بەربوویــت، ئەم جارە بتگرنەوە یەکسەر لەسێدارەت ئەدەن و وەک ئێمەش ژیانمان ئەکەوێتە مەترسیەوە. لەبەر ئــەوە بچۆرەوە بــۆ لای کاک ئارام و برادەران. ســالار عەزیزش پێــی ئەڵێت ئەوە دەمانچــەو برۆ فلان کەس بکوژە. کاکە خەلیفەشــم دەمانچەکەی لێ وەرئەگرێ و ئەڵێت دوای ئەم هەموو ئازارو ئەشکەنجەو خۆشاردنەوەی دایک و خوشک و براکانم ئەمەش نەتیجەکەی بێت. ئەڵێت باشــە دەمانچەکەی لێ وەررئەگرێ و لەسلێمانی فرۆشتی و چووەوە بۆ کەربەلا دوای ماوەی ســاڵێک هاتەوە دەرەوە چالاکیەکی لەناوشاردا بۆ کردن و دەمانچەی لە تەنزیم وەرگرتوو لەگەڵ بابە تاهیر چوونەوە دەرەوە. بەڵام دڵیان ڕەنجابوو بۆیە چووە ناو پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کە بــە ق.م ناســرابوون لەگەڵ چەند ڕەفیقێکیدا یــەک ئەگرنەوە و وەک و سڵەی قەساب و جەلالی برای سمە سوورو خوالێخۆشبوو باقی و چەندین بــرادەری تر. دوای ماوەی چەند مانگێک لە پارتیدا ئەبێت بە ســەرلق.

لەوێ درێژە بە خەبات ئەدات و لەبەر خۆنەویســـتی و دڵسۆزی هەر زوو لەوێ جێگای باوەڕی ســـەرکردایەتی بووە تاکــو ئەو ڕۆژەی بە پلانێک دەســـتگیری ئەکەن پێی ئەڵێن تۆ پەیوەندیت بە یەکێتیەوە هەیە لایان زیندانی ئەکەن. لەدواتر باسی ئازاد کردنەکەیم کردوە بەدرێژی.

※ (٧) شـــەهید تالیب ڕۆستەم ئەندامی سەرکردایەتی و فەرماندەی هەرێمی شـــەش. یەکێک بوولەســـەرکردە بوێرەکانی ئەوکاتەی شۆڕش کە سەدەها پێشـــمەرگەی لەخۆی کۆکردبووەو لەبەر ئازایەتی ودڵسۆزی بۆ نیشـــتیمان وخزمەت کردنی خەڵکی گوندنیشینەکان. لەدوای شەڕی هـــەکاری لەکاردانـــەوەی ئەوەی کە دژی کورد لە چیا بەرامبەر شـــەڕی کورد کوشتن وەستاوەو دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی ودامەزراندنی وەک مامۆســـتاو فێرکردنی قوتابیانی کورد لە گەڕەکی ئاشـــتی لەقوتابخانەی ئەردەڵان خۆڕێکخستنی بۆ بژێوی ژیانی. ژیانی ئاسایی دەست پێ کردەوە لە نێو شاری سلێمانی. ســـەرکردایەتی ئەوکاتەش ئەم هەڵوێستەی ئەم پێشـــمەرگەیەیان بە دروست نەزانی بۆیە برازای شەهیدێکی سەرکردە لە قوتابخانە دەرکرابوو، ئەچێت بۆ لای خوالێخۆشبوو ئەڵێت بەڵکو بە تەربیە بڵێـــت بۆ ئەوەی لە قوتابخانە وەرم بگرنـــەوە. ئەویش پەیمانی پێدابوو هەوڵی بۆ بدا لەو کێشەیە ڕزگاری بکا. بەڵام دوایی لەناکاو دەمانچەیەکی پێوە ئەنێت بەلای سەریەوە. دوای ئەوەی مانگێک لە خەستەخانە ئەبێت ناوی ئەو قوتابیە نابات. کە تەندروستی باش ئەبێت جارێکی تر لە ڕێگای نامە گۆڕینەوە و دۆســـتایەتی دا ســـەرکردایەتی جوابی بۆ ئەنێرێت زۆر ئەهوەنـــی ئەکەنەوە کە جارێکی تر شـــتی وا دووبارە نابێتەوە. ئەوەبوو لە دوای ماوەی ســـاڵێک زیاتر، لە شاری سلێمانی دوو پێشمەرگەیان بۆ نـــارد، لە کاتێکدا خەریکی نان کڕین بوو لە گەڕەکی چوارباخ، لەکاتێکدا کە لولەی دەمانچەی تێ ئەکەن دەڵێت دڵنیام کە پەشیمان ئەبنەوە لەم کارەی کـــە ئەیکەن لەو کاتەدا گوولەبارانی دەکەن و شـــەهیدی دەکەن. لەنێو ئاپۆڕای جەماوەرێکی زۆردا بەرەو گۆڕستانی دەبەن.

له مانگی دووی ســـاڵی ۱۹۷۸ شـــەهید عەلی عەسکەری نازدینی بۆ دێــی ڕەزڵەو توتمە ئــاگاداری کردین هێزێکی جاش دروســـت بوون کە بەرپرسەکانیان کوێخا خدر و کوێخا ڕەشە، ئێمەش وەکو پێشمەرگەکانی هەرێمی شـــەش کە بەرپرسەکەمان شـــەهید تالیب ڕۆستەم بوو و ئامر کەرتەکانیـــش پێـــک هاتبوون لە کوێخـــا قادر مەنگـــور و کوێخا عەلی قەلاوە و کوێخابایزی مامەش و خولە ســـمێڵی باوەزێی و عەبدوڵاسوورو چەندپێشـــمەرگەیەکی تر بوون، باوەڕو متمانەی گەورەیان بۆ شـــەهید تالیـــب هەبـــوو کە هەرچ بڕیارێک لـــەو دەرچێ ڕەت کردنـــەوەی نەبوو بێ ســـێ و دوو بە ئەنجامیان ئەگەیاند،ئەوەبـــوو لە بەرەبەیانێکی پێش خۆرکەوتن دامان بەســـەریاندا لەو هێرشەدا پێشـــمەرگەیەکمان بە ناوی حەمـــە ســـوور باوەزێی شـــەهیدبوو ئێمەش حەوت تەرمـــان پێ بەجێ هێشتن و یانزە کەسمان دەست بەسەرکردن لەناو دیلەکاندا کوێخا خدری تیابوو. برا پێشـــمەرگەکان ویستیان لەتۆڵەی شەهید محەمەد کوێخاخدر بکوژن،منیش وتم بە فەرمانی تالیب ڕۆستم کەس بۆی نییە بە یەخسیری بیکوژێ،هەرچـــی تەقەی لێ بکات ئەیکوژمەوە .کویخا خدر بەسەســـتێن پیاوێکی بەتەمەن بوو هێنامانەوەبۆ بارەگای خۆمان.

پێش ئـــەوەی بچین بۆ هـــەکاری شـــەهید عەبەی مەلا، لای شـــەهید تاهیرعەلـــی والی بەگ دەبێ و پێی دەڵێن تۆ خەفەر دەبی ئەو مەنجەڵە پاکژبکەیتەوە،ئەویش هەرخەریک دەبێ لەگەڵ مەنجەڵەکە و بۆی ســـپی نابێتـــەوە، دوای بێزاریەکی زۆر شـــەقێ لە مەنجەڵەکـــە هەڵئەداو دەڵێ ڕەفیقی من ئامر کەرتە، تازە بەمن دەڵێن مەنجەڵ بشـــۆو توورە دەبێ و ئەپەڕێتەوە بۆ ئەوبەر بۆ گۆڕە شـــێرو ئێمەش پێشوازییەکی گەرممان لێ کـــردو لە بارەگای خۆمـــان دامانناو ئەو چەند ڕۆژەی کە لەلای ئێمە بوو ئاوازی بۆشـــیعرێک دانا بە بۆنەی شـــەهیدبوونی سەعدی گچکەو دوانزە پێشمەرگەی قارەمان. کە لە گوندی دەشتێو (قەڵادزە) لە مانگی ٣ ساڵی ١٩٧٨ ســـەرزێ کەوتبوونە بۆسەیەکی گەورەی دوژمنەوە. ئەمەش ناوی شەهیدەکانە کە هەموویان خەڵکی هەولێر بوون:

١. ســـەعدی عەزیز، فەرماندەی هەرێمی دەشـــتی هەولێر (کۆمەڵە بوو)، ٢. پ.م فاروق سدیق، ڕابەر سیاسی،

٣. پ.م فەرخ قادر، ٤. پ.م فەریق هەمزە، ٥. .پ.م شاهێن عێزەدین، ٦. پ.م تاهر حەمە،

٧. پ.م جەبار ئیســـماعیل، ٨. پ.م عوســـمان باوە، ٩. پ.م عەزیز باپیر، ١٠. پ.م سامی عوبێد، ١١.پ.م سەباح جەمیل،١٢. پ.م ئەحمەد موحەمەد،١٣. پ.م ئەحمەد موحەمەد ئەمین.

هەروەها ئەم ٤ پێشـــمەرگانەش کە خەڵکی کۆیە بوون بە دیل گیران لەناو زێکەو لە زیندانی موســـڵ لە مانگی ٦ ســـاڵی١٩٧٨ لە ســـێدارە دران.

١. پ.م جەعفەر ئەســـوەد، ٢.پ.م حسێن عەبدولرەحمان، ٣. پ.م جەواد کەریم، ٤. پ.م کەمال واحید.

ئەوەی شـــایەنی باســـە ٢ کۆپتـــەر کەوتبوونە خـــوارەوەو زیاتر لە

١٥٠سەربازو ئەفسەر کوژرابوون و زیاتر لە ٢٠٠ ی دی بریندار بوو. یەکێک لە بەشدار کەرانی شەڕەکە قائید فەیلەق ئیسماعیل نەعێمی لەگەڵ عەمید روکن حازم برهاوی.

شەهید عەبەی مەلا شیعرەکەی بە ناوی یاد و پەیمان دانا و ئەو چەند ڕۆژە بە دەنگە زوڵاڵەکەی ئەیوت و ئەیوتەوە و من و شەهید شەعبان قلیجەی و شەهید ئەنوەری نوری قەساب گوێمان لێ ئەگرت، ئەوەندەی ئەوتەوە ئێمەش لەوکاتەدا لەبەرمان کرد بۆ یادی ئەو شەهیدە و ون نەبوونی ئەو شیعرە بەرزەی،جارێکی تر دووبارەی ئەکەمەوە بۆ پاراستنی مێژووەکەی ولێرەشەوە پێشکەشی دەکەمەوە بە گیانی پاکی شەهید عەبەی مەلا و.سەعدی گچکە و هەواڵەکانی.

نەورۆزە، جەژنی کوردی هەژارە
دنیا ڕەنگینە و جەژنە و بەهارە
شنەی شەماڵە هاژەی شەتاوە
گزوگیاو چرۆ گشتی خەملاوە
کەو لەسەر لوتکەی چیا بەشادی
دەڵێ بە ئاواز بانگی ئازادی
بەڵام بەداخەوە ژێردەستەو دیلین
بەدەست دوژمنەوە پەستوو زەلیلین
خاک و وڵاتمان داگیرکراوە
چەندەها دێهاتمان وێران کراوە
چەند ڕۆڵەی نەبەز کرا بە دارەوە
هەرلەبەرئەوەی کوردە و هەژارە
چەند پیاوی گەورەی کورد وون کراوە
هیچ کەس نازانێ بۆ کوێ براوە
نەورۆز سەد ئەوەندە دیل و بەدبەخت بێ

بە دائیم تووشی ناخۆشی وسەخت بۆ
هەریادت ئەکەم ئەمن بەجوانی
چوونکە ئەڵێن جەژنی ڕۆڵەی کوردانی
قوربانی خاک و نەورۆزی ئەمساڵ
پێشکەش کرا١٢ گوڵی ئاڵ
سەعدیی دلێر و دوانزە قارەمان
بوون بە قوربانی میللەت و هۆزیان
ڕژابە خاکە خوێنی پیرۆزیان
کوردە پێویستە قەت وازنەهێنن
لەڕێگای تێکۆشان سەر دانەوێنن

پێش ئەوەی بچین بۆ هەکاری لەناوچەکاندا بڕیار درابوو کە لەناوچەکەدا جەماعەتی سەرکردایەتی کاتی پارتی نەهێڵین. ئەوەی تەسلیم بێ بە یەکێتی ئەوە باشە، ئەگەر تەسلیم نەبوو ئەوا یان بچن بۆ ئێران یان تەسلیم بە حکومەت بێتەوە. هەندێ قوەتیان بۆ ئەو کارە سەرپشک کرد. سەرکردایەتی یەکێتی لە ناوچەی شاربازێڕ.

کاک نەوشیروان مستەفا هەموو ئەو ناوچەیەی کە ئەوی لێ بوو خوالێخۆش بووان عەبدول مەلیک عەلی عوسمان، مولازم ستاری سەعید خەڵەف و ئەنوەری عەلی نەجار و چەندین بەرپرس و پێشمەرگەی تر کە لە ١٥٠ کەسێک تێ ئەپەڕین. ئەمانە هەمووی تەسلیم بە ڕژێم بوونەوە. لەنێویان دا ئەم پێشمەرگانەی تێدا بوون: کەریمی دادە مەنە، دەرسیم، حەمەی مام عەلی، خەسرەوی حەمەی محە و چەندین پێشمەرگەی تر.

دوای چەند ڕۆژێک خۆمان ڕێک خست بەرەو هەکاری بڕۆین. لە نۆکان و گۆڕەشێرەوە لەناوەڕاستی مانگی٤ ساڵی ١٩٧٨دا بەشی یەکەمی هێزەکە بەڕێ کەوت، بەسەرپەرشتی دکتۆر خالید سەعید کە ئەندامی مەکتەبی عەسکەری بوو، شێخ حسێن بابە شێخ فەرماندەی هەرێم بوو، ڕەوف بەگ قوەتێکی پێنجوێن و هەورامانی لەگەڵدا بوو: کە ٣٠٠ پێشمەرگە ئەبوون، لە ناویاندا نزیکەی ٧٠ کەسێک ئەبوون بەبێ چەک. ئەم ڕەتڵەی یەکەم بچن بۆ هەکاری بۆ ڕێگا تاقیکردنەوەو،مقەڕو شوێنی حەوانەوە دامەزراندن بۆ ڕەتڵی دووەم. ڕەتڵی یەکەم تووشی هیچ کێشەیەک نەبوون بۆ ڕێگا. تەنیا لە ڕێگا یەک پێشمەرگە شەهید کرابوو، بەداخەوە ناوەکەیم لە یاد نەماوە.

دوای شەش ڕۆژێک هێزی دووەم بەڕێ کەوت لەنۆکانەوە، دەوڵەتی ئێران تەنگی پێ هەڵچنین کە لە نۆکان نەمێنین چوونکو خاکی ئێرانە بەڵام خۆی هێزەکە نیازی ڕۆیشتنی هەبوو بۆ هەکاری، نزیکەی حەوت سەد کەس ئەبوون. فەرماندەی ئەم هێزانە ئەمانە بوون. مام جەلال تاڵەبانی، عەلی عەسکەری، دکتۆر مەحموود، قادر جەباری، نەوشیروان مستەفا، تالیب ڕۆستەم کە فەرماندەی هەرێمی شەشی قەڵادزێ بوو،

تایەری عەلی والی بەگ ئەندامی مەکتەبی سیاسی و مەکتەبی عەسکەری بوو. جەلالی حاجی حسێن سکرتێری پاسۆک بوو، سەید کاکە فەرماندەی هەرێمی هەشتی هەولێر بوو.

شایەنی باســـە کە هەندێک مەفرەزەی بچووک لە شارەزوررو شاربازێڕ و دۆڵـــێ و قەرەداخ و قـــەڵادزێ و ناوچەکانی تر مابوونەوە، بۆ ئەوەی بۆشایی سیاسی و عەسکەری دروست نەبێت. بەڵام ئەم هێزانە کە بەڕێ ئەکـــران بۆ هەکاری لەگەڵ یەکدا تەبا نەبـــوون. ئەو ناکۆکیانەی لە ناو باڵـــە جیاوازەکانی یەکێتیدا هەبوون هەندێ ناکۆکی توندو و تیژی لەناو سەرکردایەتی دا هەبوو، بەتایبەتی لەسەر شەڕکردن لەگەڵ سەرکردایەتی کاتی پارتی دا. هەندێ لەو هێزانە پێیان وابوو کە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی شـــێوەیەکی هێمنی و پێکەوە ژیان بەتایبەتـــی هێزەکانی بزوتنەوە. بێ گومان لەوکاتەدا دوودڵی و ڕاڕایی لەناو هێزەکەدا دروست بوو. ئەم قسەو باسانە لەناو پێشمەرگەکاندا ڕەنگی دابوەوە.

لەناو پێشمەرگەدا وامان بیست کە دەوڵەتی ئێران ئیزنمان ئەدا بەناو خاکی ئێراندا بڕۆین بەرەو گوندی کونە مشـــکەو بەرەو خانەو لەوێشەوە بۆ شـــنۆ. لەوێوە دابەزین بچینەوە ئەودیوی عێراق. گوایە ئێران ژمارەی قوەتەکـــەی ئێمەی زانیوە. نـــەک هەر ڕێگەی نەدا بگـــرە بە قوەتێکی گەورەی ئاسمانی و زەمینی هەموو سنوورەکەی گرت. نەک هەر نەیهێشت ڕێگامان پێ بدا بەڵکو نەشـــی هێشـــت کە لە شـــارەکانی ئێرانەوە نانی خواردنیشمان بۆ بێت. ئەو پیلانەی سەرکردایەتی دایڕشتبوو تێک چووە. عێراقیش هەرچی شـــوێنی حەســـاس هەیە ڕێگەو بان تەنانەت قاچاغە ڕێگاکانیشی داگیر کرد هەر زوو زوو کەوتە خۆی.

ئینجا هێزێکی گەورەی ئێران لە شـــاخەکانی دەورو پشـــتی نۆکان و تورژەڵەو گۆڕەشـــێر دامەزرا بوو ئاگاداری هێزەکـــەی یەکێتی کرد ئەبێ لەماوەیەکـــی کورتدا ئەو ناوچەیە چـــۆڵ بکەن. ئیتر هەموو قوەتەکە کە ژمارەیان ٧٠٠ کەســـێ ئەبـــوو. ٢٦-٤- ١٩٧٨ بـــەڕێ کەوتین هەندێ وڵاخمان پێ بوو. هەندێکی هی مام جەلال بوو و هەندێ هی سەید کاکەو

عەلی عەســـکەری بوو. بەڕێ کەوتین بۆ ئەو دۆڵەی پشـــتی گۆڕەشـــێر لەوێـــوە بەفرێکی زۆر ڕێگاکانی لێ گرتبوویـــن و وڵاخی لێ دەرنەئەچوو ئیتـــر لەم ڕێگا گرتنەدا لە بەفر، چەند ڕۆژێک تەئخیر بووین، وردە وردە نان و خۆراک بەرەو کەم بوونەوە ئەچوو. تێپەڕبوونمان بەخاکی ئێران و تۆپ بارانکردنمان لەلایەن سوپای ئێرانەوە.

لـــە کۆبوونەوەی بەرفـــراوان و تایبەت بە بەرپرســـانی هێزەکان مام جـــەلال پێی ڕاگەیاندن کە ئەم گەشـــتە نەکەین ولەبەرژەوەندیمان نییەو ســـەرکەوتنمان مســـۆگەرنییە. بەهۆی ئـــەو کەش هەوا ناســـازەی کە هەیە لەســـەرماو ســـۆڵە کەمی خواردن و دابین کردنـــی بۆ ئەو هەموو پێشمەرگەکان.

عەلی عەسکەری چووە سەر تەپۆڵکەی گردێک و تورە بوو گۆچانەکەی دا بە بەردێکداو شـــکا وتی ئەوە چییە مام جـــەلال هەرتۆپێک ئەیدا لە زەوی تۆ پەشـــیمان دەبیتەوە، بەڕەحمەت بێ شـــەهید تالیب ڕۆستەم وتی ئەم جەولەیە نەکەین باشـــترە و بە هیـــلاک ئەچین بە هۆی کەش و هەوا نا ســـازیەی هەیە کە لەسەرماو ســـۆڵەو کەمی خواردن و دابین کردنی خواردن بۆ ئەو هەموو پێشمەرگەیە، مام جەلالیش پێشنیارەکەی ڕەحمەتی شـــەهید تالیبـــی پێ باش بوو. لەکاتـــی کۆبوونەوەکەدا تۆپ بارانێکی تر کراینەوە، شـــەهید عەلی عەســـکەری وتی ئەگەر هەرخۆشم بچم هەرئەچم. ئەوەبوو دوای ئەوە ڕۆیشتین، ڕێچکەی پێشمەرگە بەسەر بەفری کوێســـتانەکانی قەندیلدا ڕۆشـــتن شاخەکان زۆر لووس بوو. هەتا چاو بڕی ئەکرد سپی ئەچۆوە، ڕێچکەی درێژی پێشمەرگەکان لەناو بەفری قەندیل دا دیمەنێکی جوانی هەبوو هەرکەســـەو کۆڵەپشتی خۆی پێیەو بەتانییەک و دۆلکەیەک بەقەوتەوەیە هەرچەندە چامان تیا نەخواردەوە و فڕۆکەی ئێران بەردەوام بەسەرمانەوە ئەفڕین بەلای کەوپەڕدا تێپەڕین بۆ (دۆڵەنێ). دۆڵەنێ هەندێ دارو شتی لێ بوو لەوێ لامان دا بۆ پشوودان. چەند جارێک ســـەرکردەکان کۆبوونەوە کە تەواو ئەبوون ئەمانزانی هیچ گۆڕانکاریەکی تازە نییە. ئێمەی پێشـــمەرگە حەزمان ئەکرد بگەڕێیەوە.

چونکو زۆر بەهیلاک چوو بووین خەو هەر نەبوو سەرماو بەفرو بێ نانیش لەولاوە بووەســـتێ. لەوێوە بڕیار درا کە هێزێک لەگەڵ عەلی عەسکەری بڕوات، تەنیا مام جەلال و دکتۆر مەحمود و نەوشـــیروان و قادر جەباری و جەلالی حاجی حســـێن لەوێ بمێنێتەوە کە ٢٥٠ کەس زیاتر بوون کە مانەوە. ئەو پێشـــمەرگە لاوان و چەکدارەکان لەگەڵ عەلی عەســـکەری بەڕێ کەوتن. مام جەلال و عەلی عەســـکەری و دکتۆر مەحموود قسەیان بۆ کردین، مام جەلال وتی کە ئەبێ خۆ ڕاگر بین و مەدالیای شـــەرەف ئەکەین بە ئێخەتانەوە و ئەم مەسیرەیە شۆڕش بەرەو سەرکەوتن ئەبات و چەکێکی زۆر ئەهێنینەوە. مەترســـی ڕێگاکەیانی بۆ ڕوون کردینەوە کە ئەبـــێ خۆمان ئامادە بکەین بۆ هەرچی پیلانێکی دوژمنکارانە بەتایبەتی لە ئێران و عێراقەوە .

دوای ماوەیەکی کـــەم وردە وردە بەڕێکەوتین بـــەرەو قەندیل زۆری ڕێگاوبانەکان و کۆتایی نەهاتنی بەشـــەوڕۆژ مانـــدووی کردین و دەلیلی ڕێگامان ناوی زەردە خەڵکی ناوچەی کۆیە بوو. لەقەندیل حسێنی حەمەبۆر تل بۆوەبۆخوارەوە پێشمەرگە هاواریان کرد ورچە ورچە تەقەی لێ بکەن نەیەڵن دەرچێ بیکوژن!! . خەڵکەکە وتیان ورچ نییە حسێنی حەمەبۆرە کەوتۆتەخوارێ. دوای هاتنە سەرەوەی، بەردەوام بووینەوە لەڕێ کردن، ئـــەم هێزە یەک بەدوای یەکدابووین، لەگەڵ ئەوەشـــدا کەش و هەوا زۆر سەخت بوو لەگەڵ سەرماو سۆڵەو بەفربارانی زۆر تا گەیشتینە ئەمبەری حاجـــی ئۆمەران و خواردنی ڕێگامان پێ نەما، لە دوای دوانزە ســـەعات ڕاکردن بۆ ئەوبەری حاجی ئۆمەران و پەڕینەوەمان. لە هەنگاونانی زۆرو نەمانی نان،خەریک بوو هیلاکەتی و برسێتی تەنگی بە هەندێ هەڤاڵمان هەڵدەچنی و نۆربێ تاقەت بووین و ســـەرەڕای ئەمەش لەکەمینی تانک و زرێپۆشـــەکانی ڕژێمی عیراق دەربازبووین. لەگەڵ بەرەبەیاندا هێرشـــی ئاســـمانی بەســـەرمانەوە بەردەوام بوو لە نێوخاکی ئێـــران تەقەیان لێ ئەکردین و کەوتنە تۆپ باران کردنمان. بەڕێکەوتین هێزێکی ســـەربازی ئێران هات بۆمان و ئێمەش نانمان لێ بڕاو هیچ گوندێکیش نەبوو، پێنج

سەد پێشمەرگە ئەبووین. هێزەکانی دەوڵەتی ئێران لە چەند جێگایەکەوە چەندین پێشـــمەرگەیان لێکوشتین و بریندار کردین. ڕێگاو بانەکەیان بە وردی لێ تەنی بووین، بۆ ئەوەی ساردو سەرماو برسێتی تەفرو تونامان بکات. بەشـــێکی زۆری هێزەکەمان لە برســـاو لە بەفـــردا رەق بوونەوە، هەندێکیان پێ خاوس بوون، خۆشم قاچم ئاوسا بوو ماوەیەک پێ خاوس بووم. هەندێکیان هەستیان بەوە نەئەکرد کە پێڵاوەکانیان لە بەفرەکەدا لە پێیان داکەندرا بوو. قاچیان بە ڕادەیەک ئاوســـا بوو. تا ئەگەیشـــت هێزەکەمان بەرەو نەمان ئەچوو. لەســـەر بەفرەکە بزنەیەکمان دروســـت کرد، هەڵتروشکابووین دەستمان لە ملی یەکتردا بوو، بەتانیەکمان دابوو بەســـەر هەموومـــان دا بە هەڵاوی دەمی یەکتر گەرممـــان ئەبۆوە. پێک هاتبووین لەم پێشـــمەرگانە: خوالێخۆش بوو تالیب رۆستەم، خوالێخۆش بوو شەعبان گێچینەیی، خوالێخۆش بوو ئەنوەری نوری قەساب، ئەنوەری وەســـتا بەکری دەلاک، ســـمایلی مەلا عەبدول، جەمالی خاوەر، محەمەد قەڵادزەیی، جەمال کانیســـکانی، عەوڵا سوور، دارای کوێخا عەولا لەگەڵ چەند کەســـێکی تر. شەهید تالیب رۆستەم قســـەی بۆ ئەکردین لە ژێر بەتانییەکەدا کە بەســـەرماندا دابوو بۆ ئەوەی گەرممان بێتەوە، باســـی شۆڕشی دنیای بۆ ئەکردین و نمونەی زۆری بۆ ئەهێنایەوە، کە لە ڤێتنام و کەمبوودیاو گەلانی تر شـــۆڕش کراوە لەم شـــێوەیەی ئێمەیان بەسەر هاتووە. بەڵام ئەوان بۆ ئەوەی مەســـیرەکە بەردەوام بێ و ســـەرکەوتوو بێت یەکێک لە بەرگریکەرەکان خۆی فیدا کردووە کە لە کاتی لێقەومان و برسێتیدا برادەران بیخۆن. بۆ ئەوەی شۆڕش و مەسیرەکە هەر بەردەوام بێت!! پێکەنین.

دیارە ئەوەی کە خۆی ئەبەخشـــێ بۆ ئـــەو کارە ئەبێ تۆزێک قەڵەو بێت. لەناو ئێمەشدا جگە لە سمایلی مەلا عەبدول کەسی وای تیا نەبوو. شـــەهید تالیب رۆستەم وتی پێم وایە لە ســـمایل قەڵەوترتان تیا نییە، کە تۆزێک گۆشـــتی پێوە بێت. لەبەر ئەوە هەموو ســـەیری ســـمایلمان ئەکرد لەسەر بەفرەکە دانیشتبووین . ئەنوەری نوری قەسابی هەڵەبجەی،

دەیوت گەردە ملەکەی بۆ خۆم من کەوڵی ئەکەم. ئیتر لەو برســێتی و سارد و سەرما و ئازارانەدا سەیری سمایلمان ئەکردو ئەبوو بە پێکەنین. سمایل دەیگوت تالیب ڕۆستەم بە سوعبەتیەتی ئێمە خۆمان لێ کردبوو بەڕاســتی، ئەمان وت شــەویش بێت فرســەتت لــێ ئەهێنین هەر ئەت خۆین.

لە ١١-٥- ١٩٧٨ هێزەکە زۆری پەکی کەوتبوو زۆربەی لەسەر بەفرەکە مایــەوە، چوونکو بە دەیەها کەس پێــڵاوی لە پێدا داکەنرا بوو. هەندێ لە هاورێکانمان کەچێ دەماو دەکەوت کۆپتەری ئێرانی هەڵی ئەگرتەوە، بۆ زیندانەکانیان ئەبردن. ئێران لە پێشــەوە نیازیان وابوو کە تەســلیم بە عێراقیان بکەنەوە، بەڵام دوایی لەو قەرارە پەشــیمان بوونەوە. ئێران و عێراق پلانی هاوبەشــیان هەبوو بــۆ نەمانی کورد. ئەو هێزە گەورەیە نەیئەتوانــی خۆی لە دوژمن دوور بخاتەوە. دابین کردنی ئازووقە بۆ ئەو هەمــوو هێزە زۆر زەحمەت بوو. پێویســتیەکانی ئەو هێزە بۆ حەوانەوە هــەر زۆر زەحمەت بــوو، زیاتر لە پانزە ڕۆژێک کەس نــە خەوتبوو نە پشــوویەکی وای دابوو. لەبەر ئەوە تاکو ئەهات هێزەکە زیاتر شکســتی ئەهێنا. هەرچەندە کاک عەلی عەســکەری قســەی بــۆ ئەکردین، وەکو بەرزکردنەوەی مەعنەویاتێک ئەیوت مەدالیای شەرەف و ئازایەتیتان پیادا هەڵدەواســم، بەڵام بێ ســوود بوو. جووڵانی ئەو هێزە بــەو گەورەییە گوندێک نەبوو لەباوەشــمان بگرێ و نانمان بداتێ و تۆزێک بحەوێینەوە تێیدا بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت. هێزەکەمان لەوێوە بەزۆری پەکی کەوت، بەڕاستی هەڵەیەکی زۆر گەورە بوو. جار نا جارێک ڕێگاکەش هەڵە ئەکرا، تەمومژ بوو زۆرکات. ئەو کاتەی هێزەکە بەڕێ کەوت هێشــتا هەر بەهار بوو، ئەو ناوچەیەی کە ئەبوو ببڕین هەموو کوێســتانی سەخت و چۆڵ بوون، شــاخی هەزار بە هەزاری دۆڵی قوڵ و دوور لە ئاوەدانی، زۆر جار تا ســەرەتای هاوین بەفر دەیگرێ و ڕێی هاتوو چۆ کردن نادا. زۆر جار بەفری شــاخەکان و گێژەڵوکەو مەناخی ناوچەکە شکســتی زۆر گەورە دروســت ئەکات. وەکو ئێمە زۆر جار ڕێگای چەند ســەعاتێک بە چەند

ڕۆژێک تەواو نابێت. ئەوەش شکستی گەورە بوو بۆمان.

ئەوەبـــوو دوای چەندین ڕۆژ بەڕێ کەوتین، عەلی عەســـکەری،مولازم ئەنوەری مەجید سوڵتانی لەگەڵ جەمالی حەمەی خواکەرەم و عومەری مـــام تۆفیقی نارد کە هەنـــدێ نانمان بۆ پەیدابکـــەن، ئەنوەری مەجید سوڵتان گەڕایەوە بە عەلی عەسکەری وت :-

کاتێک سەربازە ئێرانییەکان ئەگەرهاتوو ڕێگایان پێ گرتین، تەقەیان لێ بکەین؟ عەلی عەســـکەری وتی ئەگەر بشـــتانکوژن نابێ تەقەیان لێ بکەن و بێنەدەست چوونکە دەبێتە هۆی لێ کەوتنەوەی کارەساتی گەورە بۆ هێزەکەمان، لە دوای چەند کاتژمێرێک هەرسێکیان دەست گیرکرابوون، ئێمەش شـــەو ڕۆژێکی تر هەنگاوی ترمان بە نێو بەفروتەمومژدا کە چاو چاوی نەدەبینـــی،زەردە ناوێک دەلیلی هێزەکەمـــان بووکە خەڵکی لای کۆیە بوو، عەلی عەســـکەری بـــە زەردەی ئەوت زەردە مەرد بەو ڕێگاکە بدۆزەرەوە پەیمانـــت ئەدەمێ کە بتکەم بەئامر هەرێم،زەردەش ئەی وت گەر ڕێگاکە نەدۆزمەوە بتکەمە ناوســـەربازگەیەکی پڕ لەســـەرباز، ئەوە باشە . چی بکەم بەخوا چاوم نابینێ. هەر یەک بەیەکی ڕیزبەندی هەموو پێشـــمەرگەکانیش دوابەدوای یەکتر ئەم وتەیان دەیان گەیاندە یەکتر تا دەگەیشتە زەردە خۆی . زەردەش ئەی وت کاک عەلی بەخوا چاوم نابینێ ڕێگاکە تەمومژە . بەهۆی نالەباری کەشـــوهەوا ڕێگاکەمان لێ ون دەبوو کە ئەمەش دەبووە هـــۆی دواکەوتن و ماندووبوونی زیاتر بۆ هێزەکەمان کـــە لەیەک ناوچە دەرباز نەدەبووین و دەخولاینەوە مانەوەشـــمان تەنیا لەســـەربەفربوو کە کۆمەڵ کۆمـــەڵ یەک بەتانیمان دەدا بەســـەرماندا و یەکترمان لەئامێز دەگرت و بەهەڵاوی دەممان یەکترمان گەرم دەکردەوە. دوای چەند ڕۆژێک ڕێگا بڕین تووشـــمان بووبە تاقە ڕەشماڵێکەوە کە لە دۆڵێکـــدا بوو تەنیا نیو فەردە ئاردی لەلابوو لەگەڵ هەندێ شـــەکر،کابرا لەخۆشەویستی پێشمەرگەو بینینی هیلاک بوونی سیمای پێشمەرگەکان لەخۆی بوورد و هەمووشتەکانی خستە بەر دەستمان و ئێمەش دەستمان کـــرد بەحەڵوا دروســـت کردن بۆ هێزەکەمان کە دواتر هەرپێشـــمەرگەو

ژەمێک لەو حەڵوەیەی بەرکــەوت بە قەبارەی ئەو دۆلکانەی کە پێیمان بــوو بەهەمیشــەیی و کەمێک ناوســکمان گەرم بووە کــە کاک عەلی عەســکەری خۆی سەرپەرشتی دابەشــکردنی ئەکرد. سەرەڕای چەندین کاتژمێری هەنگاونانی هیلاکی تری ڕێگاو بەرگەگرتنی برســێتی و سارد و ســەرما هەندێک پێشمەرگەشمان لەســەربەفرەکە لێ بەجێ ما لەوانە لەتیف ( لە هەیئەی خاسە ڕای کردبوو)، پیرۆت بەداخەوە ناوی باوکیان نازانم، ئەحمەد مەولود. من لەگەڵ ئەنوەری نوری قەساب هەڵەبجەیی و دوای دوو ڕۆژ حەمەی حەمە میراو سەیدسادقی و چەند پێشمەرگەیەکی تــر چووبوونە دێیەکــی بچکۆلانەوە بۆ نان و پێــڵاو پەیداکردن، ئەمان زانی کە پێش ئێمە خۆشــەوی مەحمود کاوانی و خالیدی مەلامستەفا و فاروق ڕەشــید پێنجوێنی و محەمەد سیاســی و جەماڵی خاوەر و دکتۆر بابە ڕەســول و دکتۆر نەوزادو کامەرانی ئەحەی شازەمان و سمەی مەلا عەبدول و حەمەی حەمە میراو حەمەی و ئەنوەری وەســتا بەکری دەلاک گیراون لەپێش ئێمەدا، ئێمەش شەو گەیشتینە ناو دێیەکی تر بڕیارماندا بچینە ماڵی یەکەمی دێیەکە ســەر پەڕبوو، پێنج شەش سەربازی ئێرانی میلی سیلاحیان ڕوتێ کردین و قاچمان زۆر ئاوسابوو بوو دەوم و چاومان قڵیشــاوبوو چواردەوریان گرتین وبەرەو پادگایان بردین، ســەرەڕای ئەو وەزعەشــمان کە تەنیا بەسەر زیندووبووین دەستیشیان بەستینەوە ئیتر بردینیان بــۆ زیندان لەوێ قاچیان تەداوی کردین و هەندێ شــۆربایان داینێ و دوای ســێ ڕۆژ تۆزێ هاتینەوە سەرخۆمان کە سەیرم کرد زیاتر لە٤٠ هەڤاڵم کە سەر بە هێزەکەبوون هەرکەسەو بەجۆرێک پەرێشانە ئیتر دەستیان بەســتینەوە و ویستیان تەسلیم بەعێراقمان بکەنەوە بردینیانە دەرەوەی زیندانەکــە هەندێ لە برادەران کەوتنە قســە کردن لەگەڵیاناو بەتایبەتی جەمالی حەمەی خواکەرەم پێنجوێنی کە زمانی فارســی باش ئەزانی لەگەڵ ســەرهەنگەکەدا قســەی کردو قەناعەتی پێ کرد و دوای کاتژمێرێک دەســتیان کردینەوەو هێنایانەوە ژوورەوە دیاربوو بە تەلەفۆن لە تارانەوە ئاگادرکرابوونەوە کە تەســلیم بــە عێراقمان نەکەنەوە. ئیتر

به ســـه‌یاره‌ی پاس بردییانین به‌ره‌و ئه‌سفه‌هان و شیرازو جه‌هرووم له‌وێ له‌ئۆردگایه‌کـدا دایان نایـــن و ڕه‌وانه‌ی شـــاره‌کانی ئێرانیان کردین هه‌ر کۆمه‌ڵه‌و به‌ر شـــارێک که‌وت من و ســـۆرانی خوشکه‌زای ئه‌بووشه‌هاب و حســـین حه‌مه بۆر و چه‌ند که‌سێکی تر ڕه‌وانه‌ی شاری کرمانیان کردین له‌وێ به‌ڕه‌حمه‌ت بێ مه‌حمودی حه‌مه‌بۆر و من و حوســـینی برای برد بۆ ڕه‌فســـنجان، ئیشـــی بۆ دۆزینه‌وه چه‌ند مانگێک له‌وێ ماینه‌وه، شه‌هید عه‌زیـــز وێڵه‌یه‌ریم له‌گـــه‌ڵ خۆمدا هێنایه‌وه هاتینه‌وه بۆ کوردســـتان بۆ ناوزه‌نـــگ ئه‌وه‌بوو مولازم عومه‌ر و زیرۆی عه‌به ڕێویم بینی چه‌ند ڕۆژێک له‌وێ ماینه‌وه دوای ئه‌وه داوای گواستنه‌وه‌م کرد بۆ هه‌رێمی چوار.

*مولازم ئه‌نوه‌ری مه‌جید ســـولتان- ســـه‌رکرده و پێشمه‌رگه‌یه‌کی له خۆبـــووردوو و قاره‌مان بوو که له‌نێو ڕیزی پێشـــمه‌رگه وجه‌ماوه‌ردا خۆشه‌ویســـت بوو که هه‌موو خه‌ون و خه‌یاڵی بۆ کورد و کوردستان بوو که دواتر له ساڵی ١٩٧٩ له ڕۆژهه‌ڵاتی کوردستان شه‌هیدبوو.

ســـاڵی ١٩٧٨ لەســـەر داوای خۆم گواســـترامەوە بۆ هەرێمی چوار. برادەران لەچیای ئاســـۆس بوون کە هەرێمی چواری لێ بوو بەرپرســـی هەرێمەکەش شـــەهید جەمالی عەلی باپیر بوو دوای چەند ڕۆژێک شـــەو برادەرانم دۆزیەوە کە لەئەشـــکەوتێکدابوون، ئەوانەی کە زۆر ناســـیاوم بوون لەوێ شەهید جەمال خۆی بوو دکتۆر شێرکۆ و دلێری شێخ رەزا و حەمەی ڕێحان بوو. قالە جاف و سەلام کوێرەکانی و مستەفا کوێرەکانی و ڕەســـوڵ جوبلاغی و سەلام سێ دەری و ئەحمەد چنارەیی و حەسەن گەلاڵی و ئاســـۆ کورەداوی کە لە زیندانی هەیئەی خاســـە ڕای کردبوو و شـــەهید بارام بەگ لە دۆڵە رووت شەهید بوو چەند برادەرێکی تریش لە وێ بوون.

من و عەزیز گێڵەری بووین کاک جەمال دوای چەند ڕۆژێک تفەنگێکی کلاشـــینکۆفی دامێ و زۆرپێی خۆش بوو چونکە زۆر تێکەڵیان بووین بە تایبەتی لەگەڵ کاکە لەتیفم .

بەڵام بارودۆخی ناوچەکانی کوردستان و دێهاتە ڕزگارکراوەکان لەڕووی بێ ئارامییەوە زۆر ئاڵۆز بوو پێشمەرگەی هیلاک کردبوو، دوای کارەساتی هـــەکاری بوو. بەهۆی ئەوەی کە بەهەمیشـــەیی دوژمن وەک گورگی هار بەدوامانەوەبوو، لەهەر ئەشـــکەوت و بنە بەردێکدا بووینایە بۆ پارێزگاری کـــردن لەخۆمان و مانەوەمان بە دوور لە دەســـتی گلاوی دوژمنان جێگا پێ و ئاســـەواری ڕێگاوبانەکانمان و هاتووچۆکانمان دەسڕیەوە. تەنانەت پاش ماوەی جگەرەشـــمان فڕێ نەدەدا، هەشـــمان بووایە ئەمان خستە ژێـــر گڵەوە. ماوەیەکی زۆر بە شـــەو جەولەمان ئەکرد بە دێهاتەکاندا لە ناوچەکانی دۆڵێ و هەتا بەری کۆسرەت. وەکو ڕۆژانێکی پێشمەرگایەتی کـــە ڕاهاتبووین بەوپەڕی بایەخ و گرنگیدانەوە لەســـەر وەختی ڕێکردنە دورو درێژەکان بەنێو ناوچە ســـەخت و دارستانەکان دا. کاتێک کاروانی پێشـــمەرگەکان پشتیان لەژێر باری کۆڵەپشت و کەلوپەل و چەکەکانمان چەمابووەوە بەمەبەســـتی پشوودان لەڕێگا لادان وچانێکمان دەدا یاخود

کاتێــک کەرێچکەی پێشــمەرگەکان فەرمانی ڕاوەســتانمان پێدەدرا لە کۆتایی ڕۆژێکی پڕ ماندوێتیدا، هەندێ پێشــمەرگە دەفتەرێکی بچووکی لەبەرباخەڵــی دەردەهێناو تیایــدا تێبینییەکانی خۆی دەنووســییەوە بۆ ئەوەی ئــەو یادەوەرییانــە لەفەوتان بیانپارێزیــن، دواتر دەربارەی نووســینەوەی بیرەوەری گەلەکەمان مێژوویەکی جوان و سەرنجڕاکێش ســەبارەت بــە شۆرشــی نەتەوەکەمان کەیــادەوەر گەلێکی برشــت و دەوڵەمەندن بەناوەڕۆکەو شۆڕشگێرانەو پەروەردەیی و مرۆییەکان.

ئەم ڕۆژانە لەڕاســتیدا بۆ ئەوە نەنووســرابوو کــە بڵاوبکرێتەوە، بۆ بڕیاردانــی بەردەوام لەســەر ڕووداوەکان و بارودۆخەکان و کەســەکان بەکەڵکی دەهاتن دەرفەتی ئەوەشــیان بۆ دەڕەخساند جڵەو بیری تیژی ڕەخنە شــل بکات و ئەو ڕۆژانە بەشــێوەیەکی زۆر ســادە نووســراوە. هەروەها نابێت ئەوەشــمان لەیاد بچێت ئەو ڕۆژانە لەساتە دەگمەنەکانی وچان و لەگەرمەی شــەکەتیی و جەستەیی و تێکۆشانێکی پێشمەرگانەو وزەی مرۆڤ دەردەچێت نووسراوە لەسەرەتای خەباتێکدا لە هەلو مەرجی مادی و هێندە سەخت و دڵڕەقانە بەرپابوو. ئەمەش جارێکی تر شێوازی کارکردن و ئیرادە پۆڵاینەکانمان بۆ ئاشــکرا ئەکات، لەبەر ئەوە ناچارین بەرەنگاری دوژمنێکی ئێجگار سەخت و لەڕووی ژمارەوە زۆر زیاتر ببینەوە ڕەنگە کەمترین کەمتەرخەمی و ســادەترین چەوتی بێتە مایەی شــەهید بوونمان.

هاوکاری خەڵکی دێهاتەکانیشمان ئەکرد دوای ماوەیەک کە بارودۆخ ئارام تربوو لە ئیش و کار، شــەوێکیان بۆ ئەوەی بزانن کەپێشــمەرگە هەیە کەوتینە چالاکی کردن چووینەســەر ڕەبایەکی پشــتی (قولەچاغ) نیو ســەعاتێک لەڕەبایەکەمان داو، دوای شــەڕێکی باش ئێمە بێ زیان بووین پێشــمەرگەکان ئەمانەبوون ( شەهید جەمال عەلی باپیر و سەلام کوێرەکانی و حســن گەلاڵی و دلێر شێخ ڕەزا و دکتۆرشێرکۆ و حەمەی ڕیحان و بارام بەگ و قالە یاخیانی و ڕەســول جوبلاخی و کەمال شێخە

و مام عەلی و عەزیز وێڵەرەیی و سـەلام سـێدەری و ئەحمەد چناریی لەگەڵ شـەهید مەلاعەلی کادیری سیاسی بوو زۆرشتی خۆشی تیابوو بە تایبەتی هاوڕێیەتی خوالێخۆشـبووان دلێرشێخ ڕەزاو حەمەی ڕیحان بێ یەک نەبووایە دانەئەمەزراین، وتەیەکی خۆشی دکتۆر شێرکۆ کەپێی ئەوتم ئا جگەرەیەکم بدەرێ منیش بەڕاسـتی جاری وا هەبوو پێم نەبوو،ئەموت پێـم نییە ئەیوت توخوا کەپێم وتـی جگەرەیەکم بدەرێ مەڵێ پێم نییە بڵێ پێمەو نایدەم و منیش سـوێندم بۆ ئەخوارد کەپێم نییە، شـێرکۆ ئەیـوت ئەزانم بەڵام بڵێ پێمەو نایدەم ئەمـوت ئاخر چۆن؟ ئەیوت کە ئەڵێیت پێمەو نایدەم من ئەمەلێکم هەیەکە هەردەستم ئەکەوێ بەڵام کە ئەڵێـت پێم نییەو بەجارێ ئەڕوخێم ئەمەلم نامێنێ. لەو سـەردەمەدا لە ئەشـکەوتەکاندا ئەماینەوە ژیانمان زۆر ناخۆش بوو کە پێشتر حەیوانی تیابوو شـەوانی زسـتان لەم ئەشـکەوتانەدا ئاگرمان دەکردەوە وەکو نیاندەرتـاڵ بە دەوری دا ڕادەکشـاین. بەیانیـان زوو لەنیمچە خەوێک ڕادەبووین لەبەر دووکەڵی زەرد لەسەر ڕووخسارمان نیشتبوو بە ئاستەم یەکترمان ئەناسـیەوە. زستان کاری خۆشتن و پاککردنەوە زۆر ئەستەم بوو بەدرێژایی مانگەکانی زسـتان ئەسـپێ ئەو دەعبایە بوو کەهێندەی بەعس ئـازاری ئەدایـن مانگی جارێک هەمـوو جلەکانمان لەتەنەکەیەک دەکردن و لەسـەرئاگر دەمانکوڵان یان جلەکانمان لەسەرئاگر دادەتەکان بەو حاڵەش لەشکری ئەسپێ زۆر بەزەحمەت دەشکاو پاشەکشێی دەکرد شـەڕە ئەسپێ و کێبڕکێی نێوان ئەسپێکان و ئەسپێ ژماردن ئەو یاریانە بـوون کە هەندێ جار لە کاتی بێکاریدا خۆمان پێ سـەرگەرم دەکردن. دوای چەند ڕۆژێک شـەهید جەمالی عەلی باپیر پێشمەرگەیەکیان هەبوو ناوی ئەسلی قاسم بوو خەڵکی ناسریە بوو. کاتی خۆی سێ کەس بوون، حسێن عەرەب لای شەهید تالیب ڕۆستەم بوو چوون بۆ ئێران. یەکێکیان لە ڕێگای تورکیا ڕەق بووەوە. ئەو قاسـم ناوەش بەر لای جەمالی عەلی باپیر کەوت ناویان نابوو نەوزاد. نەوزاد وەکو ئێمە کوردی ئەزانی خەڵکی

ناوچەکە زۆر خۆشیان ئەویست، هەم لەبەر ئەوەی کە عەرەب و غەریبە، هەم خۆشی کورێکی ڕۆح سووک بوو. دێهاتەکانی مەنتیقەی دۆڵێ ئەگەر خواردنێک یان شـــتێکی باشـــیان هەبووایە ئەویان بانـــگ ئەکردەوە بۆ ماڵـــەوە، ماوەیەک بوو نەوزاد نەخۆش کەوتبـــوو مەجبوور لەو دێهاتانە مایەوە، لەبەر ئەوەی ئەسپێ لێی دابوو، دەرمانی لێ دابوو نەی ئەتوانی بەنەخوێن ببەســـتێت، نـــەی ئەتوانی ڕێگا بکات، لـــەو ناوچانە مابووە. خەڵکی ناوچەکە وتیان ماوەیەک دیار نەماوە گوایە شـــکیان لێ کردبوو کە چووبێ بۆ ڕەبیەکە پێوەندی دروســـت کردبـــێ، خەڵکی وایان باس ئەکـــرد. خوالێخۆش بوو جەمالی عەلی باپیریـــش نەوزادی گرت و بەند بوو لامان، ڕۆژێکیان وتی نەوزاد ئەکوژم، منیش پێم وت کاک جەمال بۆ ئەیکوژی کابرا پێشـــمەرگەیەو لەگەڵماندایە، وتی چارمان نییە هەر ئەبێ بیکوژیـــن ئەگەر پێوەندی کردبێ هەموو نـــەم ناوچەیە ماڵوێران ئەبێت. وتـــی کاتی خۆی ڕەیس عورەفایەک لەناوچـــەی قامیش و دڕی گیرابوو ڕێزێکـــی زۆریان لێ گرتبـــوو دوای ئازاد بوون لە ناوچەکە سەربەســـت دەگەڕێ، کە جەیشـــەکە هاتەوە هەرچی دۆســـت و هەڤـــاڵ و هاوڕێ و تەنزیمان هەیە هەمووی بەگرتدابوو، جا لەبەر ئەوە نەوزاد ئەکوژین بەڵام هەرچ کاتێک هاتینە سەر گۆڕەکەی چەپکێ نێرگزو فاتیحە بۆ قەبرەکەی دائەیەیـــن ئینجا ئەڕۆین. وتی مانەوەی ئەمە خەتەرێکی زۆر گەورەیە کە لە شۆڕشـــی ئەدەین. ئیتر خوالێخۆش بوو جەمال قەناعەتی پێ کردین. ئیتر ئەوەبوو لە بەینی ســـێدەرو شارستێنا لە دۆڵەکە سابیر شەدەڵەیی، کـــە ئەویش بەند بـــوو، هەردووکیانی پێکەوە ڕاگـــرت کە یەک مەتریان بەین بوو، بەڵام تەنیا نەوزادی کوشـــت. سابیر چوونکو هەموو دیفاعمان لـــێ ئەکرد،گوایە بۆیە دای نا لەگەڵ نەوزادا بۆ ئەوەی ســـابیر دان بنێ بـــە تاوانەکەیا، بەڵام زۆر بێ تاوان بـــوو دوای چەند ڕۆژێک بەڕەڵا کرا، ئێستاس شۆفێرە لە ناوچەی دۆڵێ.

دوای ئەوە شەهید مەلاعەلی و دکتۆر مارف، ناوی نهێنی بوو، داوای

مۆڵەتیان کرد کە بچن هەم بۆ ڕێکخســـتن هەم ســـەر لە کەس و کاریان بدەنەوە بۆ گوندی ســـابراو. لـــەوێ ئەمێننەوە بەڵام دیار بوو حکوومەت هەســـتی پێ کردبوون چونکو شـــەهید مەلا عەلی کادیرێکی چالاک بوو هەروەهـــا دکتۆر مارفیش ماوەیەکی زۆر لای مام جەلال پێشـــمەرگە بوو بـــە ئیجازە هاتبووە خوارەوە بۆ هەندێک کاری پێویســـت بەڵام دیار بوو هەروەکو ووتم سەردەمەکەی زۆر ئاڵۆز بوو بۆ پارێزگاری کردن لە خۆمان و مانەوەمان دوور لەدەســـت دوژمـــن زۆر ئەبوایە بە وووریای هاتوچۆمان بکردایـــە، ئەبوایە هەتا جێگای قاچمان دیـــار نەبوایە بەڵام بە داخێکی زۆرەوە شـــەهید مەلا عەلی و دکتۆر مارف ناوی ڕژێمی بەعس بەدوایاندا ئەگەڕێ و وابزانم هەر لە خەودا گیرابوون. ئەوەبوو دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر دانیـــان بەهیچ دا نەنابـــوو بەس ووتبوویان پێشـــمەرگەم و لەگەڵ جەمالی عەلی باپیر و ئەواندام. حکومەت دوای چەند مانگێک لە زیندانی بادوش لە ســـێدارەیان ئەداو گیانی پاکیان بەخشییە کوردو کوردستان. ئەوەی شـــایەنی باسە شـــەهید مەلا عەلی لە زیندانی بەعسەوە چەندین شـــیعری بۆ ناردین کە ئەو ســـەردەمانە بەدەست پێشمەرگە ئەگەیشت. هەندێ لە شـــیعرەکانی بونە گۆرانی و سرودی کوردی. دوای ئەوەی کە شـــەهید مەلا عەلی و دکتۆر مارف گیرابوون دوای چەند مانگێک لەگەڵ شـــەهید جەمال ئێوارەیەکیان بەتاریکی دوای ماندوبونێکی زۆر چووینە گوندی سابراوە و موختارەکەمان گرت و هێنامان بۆناوچەی دۆڵێ، باوکی شـــەهید مەلا عەلی دوامان کەوتبوو کە زانیبووی موختارەکەمان هێناوە پێم وابوو موختەرەکەیان برازای بوو یان ئامۆزای بوو، باوکی مەلا عەلی زۆر دیفاعی لێ ئەکرد ئەیووت مەحاڵە ئەم موختارە ئەم کارەی کردبێت، گوایە ئیخباری شەهید مەلا عەلی کردبێت. بەڵام شەهی جەمال قەناعەتی نەبـــوو بەو ووتەیەی باوکی مەلا عەلـــی، ئەوەبوو لە گوندی دۆڵێبی زۆر ڕجای لە جەمالی عەلی باپیر کرد بەڵام بێ ســـوود بوو. شـــەهی جەمال پێی ووت بەیانی بەری ئەدەم دوای پێی ووت بڕۆ لە دار و شەخسەکەی

دۆڵەبی مەیتەکەی بەرەوە. ئیتر باوکی مەلا عەلی دای بەسەری خۆیداو بەگریان و باوکەڕۆ ناچاری مەیتەکەی بردەوە بۆ گوندی سابراوە.

لەو ماوانەدا زۆر جار وسەرکەوتنی باشمان بەدەست ئەهێنا، ئەمەش بووە هۆی چەند ئازارێکمان لەدەست بدەین ئیتر ڕژێم زۆر بەدژواری بە دواماندا ئەگەڕا بۆ ئەوەی لە ناومان بەرن، بە خەیاڵی خۆی لەو ناوچەیە پێشمەرگە ناهێڵێت ئەگەر شەوانێک لە ئەشکەوتەکانیش بخەوتینایە زۆر ڕێگای باریک ئەڵغامی شەخسیمان بەدوامانـدا دائەنا بەیانیان هەڵمان ئەگرتەوە.

شەهید بەکری کاکە حەمەو جەمالی کاکە حەمە لە گوندی قەرەهەنگوێ عەبەی حەمـە کەچەڵ چەک ئەکەن لەبەر بێ ئیتیزامی هەڵس و کەوتی لەنـاو گوندەکاندا. دوای چەنـد ڕۆژێک دێتەوە بۆ گوندی سـەرگەڵوو عەبەی حەمە کەچەڵ ئەڵێ بەڵکو چەکەکەم بدەیتەوە لەبەر دانیشتوانی گوندەکە چونکو عەیبە چەکم پێ نەبێت من خەڵکی ئەم گوندەم، شەهید بەکریش تفەنگەکەی ئەداتەوە، شـەهید بەکر لـە ماڵێک ئەبێت میوان ئەبن دێنەخوارەوە، شـەهید بەکری کاکە حەمـەو جەمالی کاکە حەمە جووتە برا دێن بۆ لای ماڵی خولەی سـدیق لە کۆڵانێکی باریکدا عەبەی حەمـە کەچەڵ هەردوکیان ئەکوژێ و هەر شـەوێ ئەچێ بۆ رەبایەکەی پشت ئاوایەکە کە چەند مەترێک دوور بوو لەناو دێکە. عەسکەرییەکەش کە یەنە خوارەوە ئەزانن کە عەبە ڕاسـت ئەکات هەردوکیانی کوشـتووە ئیتـر عەبەی حەمە کەچەڵ شـارەزای کون و دارو بەردی ناوچەکە بوو. وەزعمان هەتا بڵێیت ناخۆش بوو. ئیتر کونە بەرد و ئەشکەوتەکانیشمان لا پارێزراو نەبوو، دوای چەند ڕۆژێک لە گوندی جۆبلاغ دوای شـەڕێکی زۆر دژوار و قورس کە ئێمەش چوار شـەهیدمان دا. شەهیدەکان سەلام کوێرەکانی و ڕەسوڵ جۆبلاغی و خەسرەو گێڵەڕی و مستەفا کوێرەکانی بـوو، بە دەیەها لـە جاش و جەیش کوژران عەبـەی حەمە کەچەڵیش یەکێـک بوو لە کـوژراوەکان لە گوندی جۆبلاغ. هەرشـەوێ لە گوندی

قەرەهەنگوێش شـــەهید مەجیدی حمە عەزیز کە بـــە مەجید حەمەخان ناسرابوو بە برنەو کۆپتەرێکی خستە خوارەوە، ئەوەی شایەنی باسە ئەو شـــەوە مەجید حەمەخان دایکی لە ماڵی حامیـــد قەرەهەنگوێی پێکەوە بوون، دایکی بۆ ســـەردان هاتبوو بۆ لای، کە مەجید حەمەخان شـــەهید بوو دایکی لەوێ بوو. دایکی بە چاوی خۆی شەهید بوونی کوڕەکەی دی ئەو ڕۆژانە بەڕاســـتی شـــەڕەکان زۆر قورس بوون دوای شەڕێکی قورس لە گوندی قەرەهەنگوێلە مەولان و قۆمەرغانەوە چوینە ئەشـــکەوتەکەی بەینی ڕێغای دۆڵەبی کە نیو سەعاتێک دوور بوو بەلای چاڵاوەدا هەتاکو بەیانی ڕۆژ بوەوە هیچ ڕووی نەدا ئێمەش زۆر هیلاک بووین هاتینەوە ناو دۆڵەبی. بەیانییەکەی هەندێکمـــان بەپەلە نانی بەیانیمان خواردبوو بوو بە تەقـــە، جەیش جارێکی تر چواردەوری گرتین بەڵام بەلای چەمەکەوە پارێـــزراو بوو توانیمان هەموومان دەربچینە دەرەوەی گوندەکە، بەڵام لە دەرەوەی گوندەکە پشـــتی گوندەکەمان لێ گرتن تاکو ســـەعات چواری عەســـر بەڵام دنیا سارد بوو جەیشـــەکە هیلاک بوون، دوایی لێمان دان جەیشـــەکەمان ڕاونا هەتاوەکو گوندی شارستێنە بەدوایان بووین، ئێمە لەو شەرە هیچ زیانمان نەبوو بەڵام دوژمن ١٠ تاکو ١٥ کەسیان لە کوژرا بریندارێشتان هەبوو چونکو خوێنەکان دیاربوو کە بەدوای خۆیاندا ڕایان کێشـــا بوو. ئیتر لەوێشەوە هەر ئەو شەوە نەمان توانی لە هیچ شوێنێک لابدەین تاکو چاڵاوەش، لەوێش هەر کۆپتەر بەســـەرمانەوە بوو شەوەکە پێشتر باســـم کردوە لە ئەشکەوتەکانی ئاســـنگەران خەوتین، بەڕاستی تامی ئیســـراحەتی ئەو شەوە باس ناکرێت. ئەشکەوتەکە وا هەڵکەوتبوو کە ئاگرمان تیا دەکردەوە کەس لە دەرەوەی ئەشـــکەوتەکە ڕوناکی ناو ئەشـــکەوتەکەی نە ئەبینی تەنها یەک ڕێگای هەبوو بۆ ســـەرەوە ئەگەر یەک پێشـــمەرگە بە تەنها تەقەی بکردایە بە باشـــی کەس نەی ئەتوانی بێتە پێشەوە، بۆیە ئەو شەوە زۆر بە باشی خەوتین بەڵام تەنها خەفەتی ئەو پۆلە شـــەهیدەمان هەبوو کە چەند ڕۆژێک لـــەوەو پێش لەگەڵماندا

بوون و یادگاری قسه خۆشەکانیان لەیادمانا هەر ماوە. بەڕاستی ئەوانەی شــەهید بوون قارەمانی وەک ئەوانە قەت و قەت دروست نابنەوە، ئەوانە دەســت وەشــێن بوون ئەتوانم بڵێم هەموو ئەو شــەڕە قورسانە ئەوان بوون، کە خۆیان بە کوشــت دا. بۆیە جارێکی تر ئەڵێم هەزار ســـڵاو لە گیانی پاکی شــەهیدان سەلام کوێرەکانی و ڕەسوڵ جوبڵاخی و مستەفا کوێرەکانی و خەســـرەوگێڵەڕیی و مەلا عەلی سابرایی و دکتۆر مارف و مەجید حەمەخان وبەکر و جەمالی کاکە حەمە. ئەوانە هەمیشە لەیادماندا بەزیندوویی ئەمێننەوە.

له ١٨ مانگی ١ ساڵی ١٩٧٩ لەدێی هەرزنێ لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان خەڵکی دێکە بە هوتاف کێشـــان پێشـــوازییان لێ کردیـــن بۆ هاوکاری ئـــەوان چووین کە بریتی بووین لە یانزە پێشـــمەرگە، لەســـەر چەمەکە شـــێخ سدیقە کەرە لەهەواڵ و دەنگ و باسی ئەوکاتەی ئاگادارکردینەوە، لـــەوێ نانمان خوارد و خەڵکـــی دێ کەچووبوون هەواڵیـــان بردبوو بۆ مەخفەری پادگاکە و خەبەریان دابوو پێشـــمەرگە لە باشوورەوە هاتوون و پێیـــان وتـــوون ئەگەر چەکەکانتـــان دانەنێن ئەتان کوژن، تازە شـــا *ڕای کردبوو شـــاهپور بەختیاری لە جێگای خۆی دانابوو کە ســـەرۆک وەزیران بوو، ئێمەش چووینە مەرکەزەکەی بێ تووش هەموویانمان بەبێ شـــەڕ گرت لەگەڵ ٣٠ پارچە چەکی ســـوک و قورس،ئەو شەوە ماینەوە لەوێ خەڵکی هەرزن و بێتوشـــمان لەگەڵ بـــوو لەلاوەکانیان بەهێزێکی زۆرەوە بەڕێ کەوتین بۆ دەرماناوە ئەویشـــمان پـــاک کردەوە، لە دوای ئەوە ســـەربازگایەکی گـــەورە هەبوو لە گوندی قەلەڕەشـــدا بە هێزێکی گەورەوە، ئەوانیشـــمان هەموویانمان گرت لەگەڵ براکوردەکانی ڕۆژهەڵات لەوێشـــەوە بە هێزێکی تری گەورەوە چووین بەرەو شاری سەردەشت بە هـــاوکاری جەمـــاوەر و لاوەکانی و ئەو هێزەی کە لـــە دێیەکانی ترەوە، چووین ئەویشـــمان کۆنتڕۆڵ کردوشاری سەردەشـــت مینە بێتووشی بە بڵندگۆ هاواری ئەکرد ئەیوت ئەمە ئامۆزەکانمانن لە باشورەوە هاتوون و ئێمەبەتەنیا نین بە ناوشاری سەردەشت دەڕۆیشتین هەزارەها پیروگەنج و لاو ئەم لاولای شـــەقامەکەیان گرتبوو بۆ پێشـــوازی کردنمان، ئێمەش دەســـتمان بەرزکردبۆوە بـــۆ هەموویان کە ئەمەش خۆشـــترین ڕۆژبوو بـــۆ ئێمەو تـــەواوی کورد کە هەنـــدێ لەو مودەڕەعانەی کە دەســـتمان بەسەرداگرتبوو پێشمەرگەکان سواری بوون و بەناو شاردا پێی دەگەڕان، خەڵکی سەردەشـــت لە پێشـــوازییەکی گەرمدابوون لە میوانداری کردن و هاوکاری کردنی ئێمە،ئێمەش ئەنجومەنی شـــورامان بۆ دروست کردن

بۆ بەڕێوەبردنی شـــارەکە،دوای ئەوە بـــە دووهێزی گەورەوە بەرەو بانەو مهابـــاد بەڕێ کەوتین، ئێمە بەر شـــاری بانە کەوتین لەوێش ئەنجومەنی ئیدارەی شـــار هەڵبژێراو ڕێکخراو، من بەویستی خۆم گواسترامەوە بۆلای خاڵەنەبەز.ئینجابەرەومەریوان بەڕێکەوتین لەوێش خەڵکەکە بەرەوپیرمان هاتن و لەپێشوازییەکی گەرمدابوون،ئینجا هاتینەوە بۆ بانە خەڵکی شاری بانەش پێشـــوازییەکی گەرمیان لێ کردین و لەماڵی حەبیب الله ماینەوە میواندارییەکی باشیان کردین.

دوای ماوەیەک هاتینەوە شـــارباژێر من و جەلالی عەلە ورگە و بابە تاهیر و حەمەی تەیب و عوســـمانی بـــرای عومەر عەرەب و حەمە عەلی بەرزنجـــی و کاکە برا بەرزنجـــی و بەسەرپەرشـــتی خاڵەنەبەز لە دوای گەڕانەوەمان دامان بەسەر سەربازگاکەی ناو بەرزنجەدا و شەڕێکی چەند ســـەعاتی خایاندو ئێمە بێ زیـــان گەڕاینەوە بۆ جێگاکانی خۆمان. دوای ئەوە گەڕاینەوە.بۆ گوندی بزنگیان ئەو شـــەوە لەمزگەوتەکە نووســـتین، بەیانی کەهەڵســـاین شـــەهید جەلال حەمەی محەو کاک حەمە ســـەعید غەدۆ و کاک حەمەی مامە عەبەو شەهید سەلاحی عوسمانی حەمە گول، کە لە ســـلێمانی لەبەر خانەقادا بە برینداری شـــەهید بوو. شەهیدجەلال بـــوو بە پێشـــمەرگە لای کاک نەبەز لەدوای گواســـتنەوەی و بەختیاری برای پێشـــمەرگە بـــوو حەمەی مامەعەبە لەگـــەڵ جەماعەتی بەختیاری برای شـــەهید جەلال مایەوە بەڵام شەهید جەلال لای کاک نەبەز مایەوە کاکە حەمەســـەعید غەدۆ چوو بۆ سەرکردایەتی لەگەڵ شەهید سەلاحی عوسمانی حەمە گول.

* هـــەڵ هاتنی شـــای ئێـــران – ڕۆژی ١٦/١/ ١٩٧٩ شـــای ئێران وڵاتی بەجێهێشت شـــاهپور،بەختیار کرابە سەرەک وەزیران، لەشارەکان خۆپیشاندان و ڕاپەڕین بەردەوام بوون، بەڵام لەزۆر جێگا هێشتا پاسگاو پۆلیس حوکمیان دەکرد و لەناو شارەکانیشـــدا کەم و زۆر دامودەزگاکان

بەشـــلوقی کاریـــان دەکرد،بـــەڵام کاس و گێـــڵ بوو بـــوون و هەقیان بەسەرکەســـەوە نەبوو،کرێکارانی نەوتی ئێران لەمانگرتنەکەیاندا ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبوو لەسەرکەوتنی شـــۆڕش دا،لە۱۹۷۹/۲/۱ کەخومەینی گەیشـــتەوە تاران هێشتا کێشـــەکە یەکالا نەبووبووەوە، تا ڕۆژی ۲/۱۰ ئەوەبوو خومەینی بەپێکهێنانی حکومەت و دامەزراندنی مەهدی بازرگان بەســـەرۆک حکومەت کۆتایی بەحکومەتی شـــاو شـــاپور بەختیار هێناو سەرکەوتنی تەواوی شۆڕش یەکلابووەوە.

•

نەورۆزی ســاڵی/١٩٧٩ لەناو هێزی پێشمەرگەدا بیروبۆچوونی جیاواز هەبــوو لە پێــش هەکاری. لــە دوای هەکاری پەرەی ســەندو ئەوەبوو بزووتنەوە ئەیویســت نەکەوێتە بەر شاڵاوی شــەڕی براکوژی یەکێتی و پارتی، خۆیان بە باڵی سێهەم ئەزانی. سەرکردایەتی حیزبی سۆسیالست ســوور بوو لەسەر جیابوونەوە، یەکێتی لە جیابوونەوەکە زۆر زەرەرمەند بوو. هەرچەندە مام جەلال ئەیویست کێشە دروست نەبێت لە ناو یەکێتیدا بەڵام جەماعەتی بزووتنەوە ( شــەهید تایەری عەلی والی بەگ و شەهید ڕەسوڵ مامەند و دکتۆر مەحمود و قادر جەباری و سەید کاکە و حاجی برایم و قادر عەزیز و مەلا ناسیح) پێیان وابوو نابێ ئێمە شەڕی براکوژی بکەین بەڵکو بەرەیەکی یەکگرتوو دروســت بکەین لە دژی ڕژێمی بەعس. هەرچەندە مام جەلال و کۆمەڵــەش ڕەئێکی تریان هەبوو ئەیانوت تاکو دوافیشەکمان شەڕ لەگەڵ قیادە مۆقەتە ئەکەین. مام جەلال جارێکی تر زۆر هەوڵیدا کە قەناعەت بە تایەری عەلی والی بەگ و ڕەسوڵ مامەند و دکتۆر مەحمود و قادر جەباری و سەید کاکە و حاجی برایم و قادر عەزیز و مەلا ناســیح و عەدنان موفتی بێنی بەڵام چەندین کادری عەســکەری و سیاســیان لەگەڵدا چووە ئەوبەرەوە بۆ گوندی گۆڕەشێر کە ژمارەیان ٣٥٠ کەس ئەبوون، واتە بزووتنەوە بە ڕەســمی لە یەکێتی جیا بووەوە. ئەم هێزەی بزووتنەوە دژی شەڕی براکوژی بوون. لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان چەندین کادری عەسکەری و سیاسی پەیوەندیان پێوە کردن. ئیتر مام جەلال ســەرلەنوێ بزووتنەوەی دروست کردەوە لەناو یەکێتیدا. ئەوەی شایەنی باسە ڕۆیشتنی ئەو کادیرە چالاکانەیان بوو بەهۆی لاوازی بزووتنەوەی نــوێ لەناو یەکێتیدا، عومەر دەبابە سەرپەرشــتی ئەکرد. یەکێتی دوای ئەو شکســتەی هەکاری و بزووتنەوەشــی لێ جیا بووەوە. مــن لە سەردەشــت بووم کاکــە خەلیفەم جوابی بۆ نــاردم کە بچم بۆ ئۆردوگای زێوە کە ماڵی خەزوورو خێزانەکەیم پێ بناســێنێت. منیش لە سەردەشــتەوە چووم بۆ ئۆردوگای زێــوە. لەوێ چاوم بە کاکە خەلیفەو

جەلالە سوور کەوت. دوای حەوانەوە پێی وتم کە کچێکی دۆزیوەتەوە و کچی کاک فەتاحە برایەکی لەگەڵ خۆمدا پێشـــمەرگەیە ناوی ئەکرەمە. کچێکی باشـــەو ئەمەوێت خێـــزان پێک بێنم. هەروەهـــا وتی هەرچەندە بـــە دایکی کەمالی ئەحەی کەبابا جوابـــم ناردبوو بەڵام هیچ نامەیەکیان نەناردوەتەوە، ویستومە تەنیا ئەوان ئاگادار بکەم کە شتێکی وا بە نیازم. دوای گفتوگۆ کردن لەگەڵ یەکا منی برد بۆ ماڵی کاک فەتاح پێش وەخت ئاگاداری کردبوون. منیش کە چووم کاک فەتاح و خێزانەکەی و ئەکرەمی کوڕیـــان و بەیانی خێزانی کاکە خەلیفەم لەوێ بوون. دوای بەخێرهێنان و دانیشـــتن پێم گوتن لەبەر وەزعی ڕێگا ماڵەوەمـــان نەیان توانیوە لە سلێمانییەوە بێن، دایکم ئەوان بە نامە منیان ئاگار کردوە کە من بێم بۆ لای ئێوە، من لە جیاتی ئەوان هاتووم و لە جیاتی ئەوان پیرۆزبایتان لێ ئەکەم و ئینشەڵا بەختەوەر ئەبن، کە وەزعەکە باش ببێت دایکم و ئەوان دێن بۆ سەردانتان. ئەمەش یەکێکە لە سەدەها یادگاری بەینی من و کاکە خەلیفەم، کە خۆشەویستی و دڵسۆزیمان بۆ یەکتر بێ سنوور بوو.

لەمانگی١٠ ساڵی ١٩٧٩ ســـوپای پاسداران هێرشێکی گەورەی کردە سەر کوردستانی بن دەســـت ئێران. خومێنی شەڕی کوردستانی ئێرانی حەڵاڵ کرد. حاکمێکی عەســـکەرییان دانابوو بە ناوی (سادقی خلخالی) کە شـــیعەیەکی زۆر توندڕەو بـــوو. خومێنی ناردبـــووی، مخەوەل بوو، بۆ ترســـاندنی خەڵکی کوردســـتان ئەویش کەوتە ئیعدام کردنی خەڵکی کوردستان، لە دوو ڕۆژدا مەحکەمەی ئەکردو ئیعدامیشی ئەکرد.

ڕۆژێک ژنێکی بەتەمەن و دوو پیاو لە ســـنە ئەڵێن خۆ تۆ ئێمە هەر ئیعـــدام ئەکەی، بەڵام وەڵاهـــی گوناحت ئەگات چوونکـــو ئێمە زۆر بێ تاوانین. خلخالی لە وەڵامدا ئەڵێ، ئێ باشە پێتان خۆش بێ کە ئیعدامتان ئەکەین، ئەگەر بێ تاوانن ئەوا بێ قەیدو شەرت دەچنە بەهەشت.

سالّی ١٩٧٩ کاک نەبەز و پێنج کەس بووین بۆ هەوڵدان بۆ گەورەترین چالاکی لەناو شاری سلێمانی و هەوڵدان بۆ کوشتنی مولازم موحسین* یان نەگەڕانەوە و شـــەهیدبوونی هەموومان کە مـــن و جەلالی حەمەی محەو حەمەی نەعەو جەلالی عەلە ورگە و وەستا حەسەن (بەڕێوبەری ئاسایشی ســـلێمانی) بووین ئەو شـــەوە هاتینەوە نێو شاری ســـلێمانی و لە دوای ماندوبوونـــی زۆر،شـــەو ماینەوە لەماڵێکی برای خاڵـــە نەبەز، ڕۆژەکەی نیـــوەڕۆ بـــوو کاک نەبەز کۆبوونەوەیەکی پێ کردیـــن و پێی ڕاگەیاندین کـــە ئەم چالاکیە زۆر گەورەیە لەوانەیە هیچمان نەگەڕێینەوە و شـــەهید بین لەبەر ئەوە ئەبێ بیســـەلمێنین بۆ ڕژێمی بەعس کە لە هەموو کاتێکا چیمان بـــووێ ئەتوانین بیکەین، ئەبێ کەس کـــەس بەجێ نەهێڵێت لە عەسرێکی درەنگدا هەوڵ ئەدەین ئەچینە دەرەوە، ڕژێم شکی نییە کە قەت پێشـــمەرگە بتوانێ بەم کاتە زووە لەناو شاردا بێ، لەوانەیە ڕژێم وابزانێ کە چەکداری خۆیانین ئەگەر لە کاتێکدا ئەمن زانی یان هەر کەســـێک بە عەرەبی داوای هەویەی لێکردن هەوڵ بدەن بەیەک فیشـــەک زیاتر نەبێت بیکوژن با فەوزاو شت دروست نەبێت چوونکو ئێمە بۆ ئیشێکی زۆر لەوە گەورەتر هاتوینەتەوە ئەویش مولازم موحسینە یان شەهیدمان ئەکات یان هەرچیمان پێ بکرێت بەرامبەریان ئەیکەین لەبەر ئەوە زۆر وریا و ئاگاتان لە یەکتر بێت لە ڕێگا ڕۆشتنندا. ئەوەی جێگای ڕێزە کاک نەبەز بە ئێمەی ڕاگەیاندبوو کە بەهیچ شـــێوەیەک تەقە لە پۆلیســـی کورد مەکەن ئەگەر ئـــەوان تەقەیان نەکرد خۆتانیان لێ گێل بکـــەن. لەدوکانەکانی خەتیب لای گەڕەکـــی حاجی حان مـــن و جەلالی حەمەی محە بووین لەبەردەمی دوکانەکە ســـەیارەیەکی نەجدە هات ئێمە تفەنگەکەمان بەدەســـتمانەوە بوو لە پشتمانەوە تەنیا سێ چوار مەتر ئەبوو چوار پۆلیسی کورد بوون یەکێکیان لەتەمەنیشدا بوو. ئەگەر مەبەستمان بووایە هەر چواریانمان بە ئاســـانی لەناوئەبرد. ئەوان حەپەسان کە ئێمەیان دی ڕۆیشتن و هیچیان نەکرد. ئەمە بۆ ئەوە ئەگێڕمەوە کە زۆر جار دەســـتمان پاراســـتووە لە پۆلیسی کورد، چوونکە بە پۆلیسی خۆمانمان ئەزانی.

ســـبەی ئێوارە ســـەعات و نیوێکی ڕۆژ مابوو هاتینە دەرەوە بەرەو

فلكەی كاوەی ئاسـنگەر كەپێیان ڕاگەیاندین مولازم موحسـین بە خۆی و دوو سـەیارەوە وەسـتاوە كە چووین لەوێ نەبوو جـادە و جادە بە بەردەمی شەقامی سجن هاتینە خوار هەرشەشمان تۆزێک بەین هەبوو لە نێوانماندا،كەس ئێمەی نەدەناسـی بەڵام لە ناو هەموومان‌دا خاڵە نەبەز ناسراوو كە خەڵک سـەلامیان لێ ئەكرد،بەلای جادەی پیرەمێرد هاتینە خـوارێ بۆلای ئۆرزدی بڕیارماندابوو كە تەرمەكانمان بەدوای سـەیارەدا ڕاكێشـن. وتیان مولازم موحسین لەبەردەم ئۆرزدیایە بە داخەوە لەوێش نەبوو زۆرپەست و خەمباربووین كە نەمان ئەدۆزینەوە، دواتر شەو چووین بۆماڵی یاسـینی دارا سـەلیم لە گەڕەكی حاجی حان كە زۆر تێكۆشەر بوو،میواندارییەكی جوانی كردین لە ئامادەكردنی نان ئامادەكردن بۆمان و دوای چەند دەقیقەیەک خاڵە نەبەز تەلەفۆنی كرد بۆ مولازم محسـین من ڕاوەستابووم لەتەنیشتیەوە داوای لە بەداله كرد كە مودیریەتی ئەمنی بداتێ كە دایە خاڵەنەبەز لەگەڵ مولازم محسین قسەی كردو بە عەرەبی وتی كە بە ڕۆژكەشخەیی مەكە بەسەر لاوانی كوردا من نەبەزم، دیار بوو ئەو وتی نەبەز كێیە ئەویش وتی من خولەی جگەرم ئەگەر ناترسی و ئازای ئێمە لەلای ئۆرزدین، ئیتر دوای ئـەوە تەلەفۆنەكە داخرایەوە،كاتێكمان زانـی بە هێزێكی گەورەی پڕ لە چەكەوە دەوروبەری گەڕەكی ئۆرزدییان تـەوق دا، ئێمە لە دوكانەكانـی خەتیبەوە بەرەو كارگەی سـەهۆڵ لە ئیبراهیم پاشـا بەڕێ كەوتین، لەوێ جەماعەتی تەواری دوو سەیارەیان كەوتە بۆسـەكەوە كە ژمارەیان هەشت كەس بوون. زۆر بە چاكی لێیان درا، هەر هەشـت تەواریەكە كوژران و سەیارەكانیشـیان سوتێنراو گڕی گرت، بەڵام سەیارەكانی دوای ئەوان كردیان بە تەقە كردن و دیفاع كردن نەیان هێشـت هیچ پێشمەرگەیەک بچێتە سەر سـەیارەكانیان. ئێمەش بەبـێ زیان و سـەركەوتووانە گەڕاینەوە بۆ ناوچـەی دۆڵەڕوت. ئەوەی شایەنی باسە بۆ ڕۆژی دواتر ئێوارەكەی زانیمان كە مولازم محسین خۆی تێدا نەبووە، نەفسەرێكی تری تیا بووبوو.




* موڵازم محسین- کابرایەکی خوێن ڕێژ بوو، بەڕەگەز فەلەستینی بوو، لەوکاتەدا ڕژێم ناردبووی بۆ شاری سلێمانی بۆ دامرکاندنەوەی هەستی کوردایەتی گەنجەکانمان بەهێزێکی گەورەو پـڕ چەک،کەچەند جارێک شـۆڕش هەوڵــی دابوو بەسـزای شۆڕشــی بگەیەنن لەتۆڵەی ئـەو هەموو لاوەی کـە بێ گوناح شەهیدی ئەکردن، ڕێ نە ئەکەوت لەبەر ئەوەی کابرایەکی ترسنۆک بوو بێ هێزی گەورەو پڕ چـەک هەنگاوی نەدەنا بۆ هیچ شـوێنێک و لەفرسەتدا دەرنەکەوت و دیارنەدەما.

دوای ماوەیەک کاک نەبەز چوو بۆ سەرکردایەتی و لەسەر داوای ئەوان چوو بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەندێ کاریان پێ سپێردرا بوو من و شەهید جەلالیش لەناوچەی شاربازێر ماینەوە بۆ هەندێ کاری حیزبی لەوماوەیەدا لەشاربازێر هێزی پێشمەرگە کەسی لێ نەبوو تەنیا من و ئەو نەبێ ئێمەش وامـــان ئەکرد کەجەماوەر و دوژمن بزانن هێزێکی زۆری لێیە لەوســاڵەدا ۱۹۷۹ سەربازگەیەکی گەورە لە قەیماسە بوو چەندین ڕەبایەشیان هەبوو واتە لە شـــاربازێر کەزۆر بەئاســـانی نەت ئەتوانی جەولەبکەی، بۆیە من و شـــەهید جەلالی حەمـــەی مەحە زۆر جار بەچاکمـــان ئەزانی کەبچین بۆ وێڵەیەر بەشـــەو زۆر نزیک ڕەبیەکەی وێڵەیـــەر دەخەوتین وەحاجی ســـەعید وێڵەیەر خواردنی بۆ ئەناردین بەجەلالی کوڕیدا، بەڕاســـتی لەو کاتـــەدا گوزەرانمان زۆر ســـەخت بوو یان ئەچووینەوە بۆ ماڵی شـــێخ ڕەحیم کەئەکاتە باوکی عومەر ئـــەو گەڕەکەی ئەوان تابڵێیت گەڕەکێکی نیشـــتیمان پەروەرو خزمەت کار بە شۆڕش و پێشمەرگە بوون کەهەندێ جار بەوێدا تێدەپەڕین خەڵکی ئەو گەڕەکە ئەیان زانی ئێمە پێشمەرگەین و تاقـــم وتفەنگمان پێیە هیچ ترســـمان لێیان نەبـــوو بەڵکو هەندێ جار هاوکاریشـــیان ئەکردین لەزانیاری و ڕێنمایی و ڕێگا نیشـــاندان ئێمەش

لەبری هەســـتی نەتەوایەتیان زیاتر هۆشـــیارمان دەکردنەوە لەمەبەستی شـــۆڕش و ڕزگارکردنی میللەتەکەمان لەدەست زوڵم و زۆرداری دوژمنان و هەســـتێکی وامان لادروست دەکردن کەهیچ کاتێک بیر لەوە نەکەنەوە کە هاوکاری دوژمن بن لەپشـــت شـــکاندنی میللەت و شۆڕشـــی خۆیان بەرامبەر ســـامانێکی کەم و بێ نرخ خۆمانمان بە نموونە بۆ ئەهێنانەوە کە گیانی خۆمان خستۆتە نێو لەپی دەستمان لە بری ئەوەی بزانێ کورد پێشمەرگەی هەیەو داوای ئازادی خۆی دەکات.

چەندین جار هێرشی سەربازی دەکرا بۆ شارباژێر بۆ ئەوەی سەرکوتی میللەتی کورد بکەن لەهاوکاری نەکردنی پێشـــمەرگە، ئێمە بەهەمیشەی لـــە دەرەوەی دێ دەخەوتین، من و شـــەهید جەلالـــی حەمەی.محە لە شارباژێر بووین. بەڵام دوژمن نەی ئەزانی کە تەنیا دوو کەسین، لەوکاتەدا هێزەکانمان بۆ هاوکاری کوردستانی ڕۆژهەڵات چووبوون. سەربازەکانیش نەیان ئەتوانی بەژمارەی کەم ئەو هێرشانە بکەن بەڵکو هێزی گەورەیان پێکەوە دەنا، لە هێرشـــێکی ســـەربازی دا دوای گەڕانەوەی سەربازەکان شـــەو ســـەربازێک بەخۆیی و تفەنگەکەیەوە ڕێگا هەڵە ئەکات، شەهید بابەتاهیر بەڕێکەوت لە گوندی عازەبان ی شـــارباژێر ئەبێ، ســـەربازەکە ڕێگای ئەکەوێتە ئەوناوە لەوێش شـــەهید بابەتاهیر دەست گیری ئەکات، سەربازەکە ناوی کازم دەبێت.

لەرێگای شـــارباژێرەوە هاتین کە بیســـتبووم براکەم کاکە (خەلیفە) م لەلایەن دەســـتەیەک لە پارتی دیموکراتی کوردســـتانەوە گیرابوو لەسەر راپۆرتێکی نا راســـتی حەمەی رەمەزان کە گوایـــە کاکە خەلیفەم ئیش بۆ کۆمەڵـــە ئەکات، کەبەشـــەرتێ کاکم لە مانگی دووی ســـاڵی ١٩٨٠ لەناوپارتیدا بەرپرسیارێتی جۆراوجۆری هەبوو، لە کاتی بەندکردنەکەیدا بەرپرســـی فەرماندەی عەســـکەری بوو. هێزێکی تایبەتی پارتی خۆی و چەند پێشـــمەرگەیەک بەند ئەکەن. کە ئەمەش ناوی پێشـــمەرگەکانە: کەمالـــی برای مەجیە گورگە،خوالێخۆش بوو، کامەرانی حەمە تاتە، قادر ئەحمەد هەمەوەنی، ئەنوەر عوسمان، سۆران و چەند پێشمەرگەیەکی تر

ئەوەی شایەنی باسە پێشمەرگەکان هەمووی بەردرابوون.

منیش لـــە بیرکردنەوەیەکی زۆر قووڵـــدا بووم،چەند بیروبۆچوونێک بەمێشکمدا ئەهات، دوا بۆچوونم بڕیارم دا نوری حاجی عەلی و سیروانی سەعید و سەرداری برای و عەلی کەریم شاهیرو چالاک لەگەڵ دا بوو،سێ بـــرادەری تـــر داوای لێ بووردن ئەکـــەم ناوەکانیان نازانـــم، چووین بۆ سەرکردایەتی ناوزەنگ، من زۆر شارەزام لە رێگا سمایلی مەلاعەبدولم دی لەسەر شاخی بەمۆ بوو ئەگەر هەڵە نەبم دەنگ و باسمان لێ پرسی وتی وەڵا حەمە شەریفی براتیان کوشتوە، واتە (خەلیفە) لە لایەن جەماعەتی پارتی، ئیتر لەو کاتەدا نەمئەزانی چۆن هەنگاو بنێم بۆ ســـەرکردایەتی. نـــوری حاجـــی عەلی و ئەوان تـــۆزێ دڵنەواییان دامـــەوە و وتی پارتی بەقوەتێکی زۆرەوە هاتووە بۆ دۆڵەتو و بێدەلان و ئاڵی ڕەش ئەو ســـەر شـــاخانەیان هەموو گرتوە، یەکێتیش ئەمبەر ناوزەنگ و شـــێنێ و نزیک سونێ، کەوتمە بیرکردنەوەیەکی ترو زۆر زیاتر بەخێرایی تر خۆم گەیاندە سەرکردایەتی، ئەوەبوو راست بوو هێزی پارتی و یەکێتی بەرامبەر یەکتری بوون بۆیە لای خۆمەوە بڕیارو چارەســـەرم هەبوو. بە هەڤاڵانم وت ئێمە چەکمان هەڵ گرتووە بۆ ئـــەوەی بەرگری لەنەتەوەکەمان بکەین، وتیان راســـتە، وتم ئێمە ئەگەر لەلای ئەم لابمێنینەوە ئەم لا جەلالیەو ئەولاش

مەلاییە،ئــەوە هەر هیــچ خزمەتمان بە کورد نەکردوە،شــەڕ لەگەڵ ئەم لابکەین هەرخراپە، شــەڕ لەسەر ئەولاش بکەینەوە هەرخراپە و هەمووی خیانەتە لە کوردە و وتیان ئەی حەل چیبە، وتم کاکە ئێمەی پێشمەرگە نــە ئەم لائەبین نە ئەولاش ئەچیــن بۆلای کاکە تایەری عەلی والی بەگ هەرچی ڕەفیق و خۆشەویســتمان هەیە هەموو لەوێیە ئەوە بە ڕەحمەت بێ کاکە جەبارو مەحمــودی حەمەتاتە و جەمالی حەلاو عومەری حەلاو جەمالی مچەی شــیرو ئەمانەی کە ئێســتا ماون شــوکر کاکە سالاری هەیبەت و ســمایل ئەمنەو بەکرسیرەمێرگی و عومەری حەمدون و چەند هەڤاڵێکی تر.

ئینجــا کاک نــوری و برادەران وتیان لەکوێــوە بڕۆین بۆ لایان، وتم من زۆر شــارەزام ڕێگاتان پیشــان ئەدەم، خۆشم بەیانی یان دووبەیانی دێمە ئەو بەرەوە، ئەوە بوو بردمن بۆلای شێنێ ڕێگام پیشان دان و لەم چەمــە بپەڕنەوە بۆ بێدەلان بچنە ئەودۆڵەوە ئەوە دۆڵەتووە، بەرەحمەت بــێ کاکە تاهیری عەلی والــی بەگ لەوێیە هەمــوو برادەرانیش لەوێن، چیمان داوە لەناو ئەماندا، ئەوانەی ئەوێ هەمووی هاوڕێی گیانی بەگیانی ئێمەن،ئەمەشیان نە ئەملان و نە ئەولان، ئەوە بوو برادەران کاک نوری و سیروان وسەردارو عەلی کەریم شاهیر و چالاک و سێ برادەری تر چوونە ئەوبەرەوە بۆلای برادەران ڕۆیشتن ئۆغریان کرد.

خۆشم دوای دوو ڕۆژوشەو چووم بۆ دۆڵەتوو لەبەرئەوە ئەو سەردەمە بە ڕۆژ دوو قوەتی زۆر بەرامبەر یەک بوون،زیاتر هاتوچۆ بە شەوان بوو چــووم کاک جەبار و باقی برادەرانــم لەوێ دی دوایی چووم بۆلای کاک تاهیری عەلی والی بەگ و کاک ڕەسول مامەند و کاک ڕەسوڵیشم زۆرباش ئەناســی بەخێرهاتنێکی زۆرگەرمیان لێ کردم و دوای قسەکردنێکی زۆر دەنگ و باس و ڕووداوەکانم وەکو خۆی بۆ گێڕایەوە.

ئیتــر کاک تاهیر و کاک ڕەســول چوون بۆلای کاک مســعودبارزانی منیش لەگەڵیان ڕۆیشتم کەلەوێوە زۆر نزیک بوون کە چووین تفەنگەکەم

له عومەری حەمدوون وەرگرت و تاقمەکەم بەســت و لەگەڵ کاک تاهیری ڕەحمەتی ئەم پێشمەرگانەشمان لەگەڵدابوو شەهید جەبارعەلی حەویز و خولەی حەمەتاتە و عومەری حەمدون و چەند برادەرێکی تر.

له ســەرەتای مانگی ٨ ســاڵی ١٩٨٠ بەرەی جوودیــان دامەزراند، کەچوویــن بەڕەحمەت بــێ کاک فەتاح ئاغام لــەوێ دی من ناوی کاک فەتاحم بیســتوو نەم دیبوو، بۆیە کە دیم پیاوێکی هەتا بڵێی سەروزمان شیرین و هێمن بوو، کابرایەکی زیرەک بوو بەرامبەرەکەی ئەخوێنەوە وای لێ ئەکردی یەکسەر خۆشــت بوێ، کاتی خۆی ئەم پیاوە خۆشەویستی باوکی ڕەحمەتیشم بوو، له ساڵی ١٩٦٩ دراوسێ دوکانی باوکم بوو. بۆیە خۆشەویســتیەک و متمانەیەک لەبەینمانــدا بوو، کاک فەتاحم ماچ کردو سڵاوڕێزی کاکە لەتیفم پێگەیاند کە زۆر دۆستمان بوو ئینجا کە کاک تاهیر و کاک ڕەسول مامەند کۆبوونەوە لەگەڵ کاک مەسعود کۆبوونەوەی جوود بوو، واتە بوون بەیەک و برایەتی وەک بەرەیەک وابوو ســێ کاتژمێرێکی خایانــد، من هەر دە مەترێک لەوانەوە دووربووم کە تەواوبوون خۆم کرد بە خێمەکەی کاک مەســعود، پێم وت بۆ خەلیفەت گرتووە پێشمەرگەی خۆتانە، کاک مســعود زۆر بە لەسەرخۆییەوە وتی ویستویەتی بچێتە ناو جەلالــی و برایەکیشــی جەلالیە، منیش ڕووم تێ کــردو وتم ئەوەی کە لەگەڵ ئێوەدا نەبێ بە جەلالی ئەزانن، کاک مەسعود وتی نا وانییە منیش وتــم من برای ئەوم کە لەگەڵ کاک تاهیردام،بەڵکو نامەیەکم بدەیتێ کە بەری بدەن، ئەوە هەمووی حەمەی ڕەمەزان درۆی بۆ دروست کردوە،کاک مەســعودیش بەڵێنی پێ داین کە خۆی ئەچێتەوە بۆ زێوە و ڕاژان بەری ئەدات. بروسکەیەکیشی کرد کە ڕێزی لێ بگیرێ ئینجا بەڕاستی کە کاک مەســعودم دی بەم لەسەرخۆییەو زۆر لەســەرخۆیی جوابی دامەوە زۆر تەئسیری تێ کردم، ئینجا چووم بۆ بینینی کاکە خەلیفەم لە شاری ورمێ دێی هەڵاج زیندانەکە لە شاخێکی هەلاج بوو بەرزبوو وابزانم ناوی هەلاج بــوو، من و کاک جەباری عەلی عەوێــزم لەگەڵدابوو چووین بۆ ئەوەی،

شـــەڕێکی زۆر قورس هەبـــوو، لەوێ لە بەینی دیموکـــرات و حکومەتی ئێران مەجالم نەبوو کە بچمە دێیەکە بەڵام بە جیهاز قسەم لەگەڵدا کرد پێم ڕاگەیاند کاک مەســـعود لەم چەنـــد ڕۆژەدا بەرت ئەدات، بەس تەنیا حەزم کردوە جارێ قســـەت لەگەڵ بکەم ئەوە بوو گەڕامەوە بۆ دۆڵەتوو بـــۆ لای کاک تاهیر دوای چەند ڕۆژێک لەگەڵ بەڕەحمەت بێ کاک تاهیر چووین بۆ کەوپەر تەنیا دوودەمانچەمان پێبوو چووین بەدەشتی میراوی. لەدوایـــدا چووین بۆ میراوی، لەوێ ســـواری ســـەیارەبووین بۆ کەوپەر، کەوپەر لەبینی سەردەشـــت وخانەدایە بارەگای کاک مەسعود لەوێ بوو. کە گەیشتین بۆلای کەوپەر،کاکە فەتاح ئاغا و تاهیری حەمەبەگ لەگەڵ کاک فەتاح بوو تۆزێ دانیشـــتین و ماندووبوونی هیلاکی مان ڕەواندەوە. دوای نان خواردن کاک تاهیر و کاک فەتاح چوون بۆ لای کاک مەســـعود چەنـــد مەترێک لە خێمەکەی ئێمەوە دووربوون. من و تاهیری حەمەبەگ ئەو دوو شەوە لە جێگای کاک فەتاح ئەخەوتم کاک تاهیری حەمەبەگیش لەخێمەکەبوو. لەگەڵ کاک تاهیری حەمەبەگیش زۆر هاوڕێ یەک بووین، ئەو شەوانە بەقسەی خۆش ئەمان بردە سەر. کاک تاهیرعەلی والی بەگ کۆبوونەوەکانیان زۆرگرنگ بوو لەگەڵ کاک مەسعود، نیوەڕۆ و ئێوارە لای کاک مەسعودەوە نانمان بۆ ئەهات،کۆبوونەوەی جورد بوو دوایی گەڕاینەوە بۆ دۆڵەتـــوو بۆ بارەگا، دوای چەند ڕۆژێـــک خەبەرێکی زۆرجەرگ بڕ و ناخۆشمان بیست، ئەویش ئەوە بوو کە کاک فەتاح لە شەڕێکی دەستەو ئێخە لـــە حاجی هۆمەران بۆ پاکردنەوەی گونـــدەکان لە ڕژێمی بەعس شەهیدکرا، کە هەموو پێشـــمەرگەی پەشۆکان. کاک تاهیری عەلی والی بەگ زۆر زۆر خەم باربوو، لە بەرخۆیەوە شـــتی ئەوت، ئەیوت: براوکەس و خۆشەویســـت ترین کەسم لەدەست چوو. لەڕاستیدا ناتوانم ناڕەحەتی ئەم خەڵکە باس بکەم. لە گەڵ کاک تاهیری عەلی والی بەگ دوای چەند هەفتەیـــەک چووین بـــۆ کەوپەڕ ئەمجارە بەڕەحمـــەت بێ کاک ئەنوەری ئامـــۆزای کاک ڕۆیســـتەم وجەباری عەلی حەویز و چەند پێشـــمەرگەیەکی

تریــش چووین بۆ کەوپەڕ لەوێ بەڕەحمەت بێ کاک عەبدوڵڵا ئاغاو کاکە تاهیــری حەمەبەگ کاک بێســتوونی حەمەومینەفەنی و بارزانی حەمەی سابیر هەمەوەنی لەگەڵ شەهید فەتاح ئاغادا بوو خۆشی بەڕەحمەت بێ شەهیدبوو بەڕاستی قارەمان بوو،ئەیانگێڕایەوە ئەیان وت بارزانی حەمەی ســابیر هەمەوەنی ئەوەندە قارەمان بووە لە حاجی هۆمەران شــەقی لە قوتوو هەڵداوە وای زانیوە ئەڵغامە لەپێشیەوە بووە،ئیتر بۆ بەیانی کاک تاهیــری عەلی والی بەگ و کاک عەبدوڵڵــە ئاغا و هەڤاڵ حەمەڕەحیم و بێســتونی حەمەومینە فەنی و تاهیر حەمەبەگ چووین بۆ سەرئارامگای کاکە فەتاح لەنەغەدە کە چووینە سەرئارامگاکەی زۆر چاک لەبیرمە کاک عەبدوڵڵا ئاغا کەســەیری کرد چیایەک پاڵ کەوتووە، یەکەم وتەی کاک فەتاح .... لێم ببوورە ڕێگام زۆر دوور بوو نەمتوانی بە زیندوویی دەست لەملانت بم بەڵام ئەوە ئێســتا دەســتم لەملتایە کاکە گیان لەگەڵ کاکە تاهیری عەلی والی بەگ دڵخۆشــی عەبــدوڵا ئاغای ئەدایەوە دوای چەند کاتژمێرێک چووین بۆ نەغەدە .

لە کۆتایی مانگی ١٠ ســاڵی ١٩٨٠ من چــووم بۆ ڕاژان بۆ لای کاک مەســعود ئیتر، مۆڵەتم لەکاک تاهیر وەرگرت و چووم. مەکتەبی سیاسی لەوێ بوو کاک مەســعودماڵی لەسلیڤانا بوو نزیک ڕاژان،دووسێ شەو لە ڕاژان میوانی سەید موسا بووم. بەسکرتێرەکەی کاک مەسعودم وتبوو کە هاتووم لەسەر فەرمانی خۆی، ئەیناسیم. بەیانییەکیان سەعات ٨ چووم بۆ مەکتەبی سیاســی کە جێبەکەیم لە دوورەوە دی یەکسەر چوومە بەر سەیارەکەی زۆربێ تاقەت بووم کاک مەسعود و کاک ئیدریس لەتەنیشت یەک بوون وتم کاک مســعود تۆ خۆت پەیمانت دامێ کە کاکە خەلیفەم بــۆ بەربدەی نامەم بەیتێ. کاک مەســعود زۆر بەهێمنی وتی: نەمزانیوە هاتووی یەک تۆز سەبرم لێ بگرە لە ژوورەوە نامەکەت بۆ ئەنووسم لەگەڵ کاک ئیدریس بە ڕەحمەت بێ چوونە ژوورەوە نامەکەیان نووســی، دوای کەمێک دایانە دەستم منیش چووم بۆ دێی هەلاج لە بناری شاخەکە بوو

لەوێ چووم بۆلای بەرپرسی بەندیخانەکە نامەکەی کاک مەسعودم دایەو ئیتر کاکە خەلیفەیان بۆ بانگ کردم کەچەند تامەزرۆی بینینیم دەکرد کە لەخۆشـــیدا خەریک بوو شاگەشکەبم، هێندە مابوو بەباڵ بچم بەرەوپیری و دەست لەملانی بکەم،کاتێکیش هات تێر ئەم لاولای یەکترمان ماچ کرد و گریان و پێکەنینمان تێکەڵی ماچ و ئامێزکردنی یەکتربوون، بەڕاســـتی نەک برام بوو هەڤاڵ و هاوســـەنگەرم بوو لە خەبات و پێشمەرگایەتی و بێ ســـێ و دوو ئەو ناوچەیەمان جێ هێشتوو بەرەو زێوە بەڕێ کەوتین، لـــە مزگەوتەکەی زێـــوە بەڕێز قادرقادر وحاجـــی مەحمود گەورە دێێ و شـــەریفی خاڵەو حەمەڕەشید قۆپچە و ساڵحی خاڵە و عوسمانی حاجی ســـاڵح سوارەی لالە مارف کەنەکەوەیی بوو شەماڵ لە مزگەوتەکەی زێوە دابوون، بەڕێز قادرقادر زۆر دڵنەوایی داینەوە . ئێمەش لە زێوەوە کەوتینە ڕێ بەرەو ڕەزایە بەڵام کاتەکەی زۆر سارد بوو لەبەر ئەوە قەمسەڵەکەم داکـــەن و لەبەری کاکە خەلیفەم کرد من تۆزێ جلەکانم باشـــتربوو. لە ڕەزایـــە بەڕێکەوت ڕەئیس عەبدولی مان دی لە ئوتێل گوڵشـــەنگ بوو. لەوێشـــەوە هاتینەوە بەرەو نەغەدە ئەوکاتە ناوشارەکان چۆڵ بوو لەبەر شـــەڕی لەلایەک دیموکرات و کۆمەڵە لـــە دژی ئێران لەلایەکیش جەنگی گەورە هەبوو لەبەینی عێراق و ئێراندا، ئەو کاتانە بۆردوو مانی شارەکان دەستی پێ کردبوو لەبەر ئەوە شار بۆنی خوێنی لێ ئەهات شارێکی مات و تۆزێ چۆڵ بوو. لەناوشـــار تووشی شـــەهید حەمە قووتە سەرگەڵوی بووین دیار بوو وەزعی مادی باش نەبوو هەرچەندە خۆشـــمان زۆر باش نەبووین بەڵام ســـەد تمەنمان دایە بۆ نان خواردن. ئەوشـــەوە لە حەمام خۆمان شت و بەیانیەکەی بە پاسێک چووین بەرەو گوندی کونەمشکە بە پێش بەدەشـــتی میراوێ بە دوو سەعاتێک گەڕاینەوە بۆ دۆڵەتوو. لەوێ گەشتینە مقەڕو پێشەکی هەموویان شەهیدی سەرکردە کاک تاهیر کاکە خلیفـــەی ماچ کـــرد و بەخێرهاتنی کردو دوای لەگـــەڵ باقی برادەران دا یەکتر ماچ کردن و کەزیاتر لە پەنجا کەسێکیان ڕەفیق و خۆشەویستمان

بـــوون هەندێکیـــان هەروەکو برا وابووین ئەمەش نـــاوی هەندێکیانە لەو برایانەی ئەوکاتە: شەهید جەباری عەلی حەوێز، جەمالی حەلاو، عومەری حـــەلاو، مەحمود حەمە تاتـــە، عەلی کەریم شـــایەر، خاڵە نەجم، بەکر ســـیرەمێرگی، ســـالاری هەیبەت، نوری حاجی عەلی، دەرســـیم، عومەر حەمدون، ســـمایلی ئەمنە، عومەر مام تۆفیق، سیروان مەحمود، سەردار مەحمود، ســـورەی عەلی حەوێـــز، کامەرانی حەمە تاتـــە، مام ئاراس، عەلـــە وەلەو، ژیلوانی مام تۆفیق، عەبـــدوڵا هەمزە و زۆری تر کە داوای لێبوردن ئەکەم ناوەکنیان لەیاد نەماوە. ئەمانە هەمویان لەگەڵ شەهیدی ســـەرکردە کاک تاهیری عەلی والی بەگدا بوون. دوای پشـــوویەکی کەم لەگەڵ برادەراندا بەڕێ کەوتین و هاتین بە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا هاتین بـــەو گوندانەدا یەکەم بۆ بێوران و ئینجا قەلە ڕەشـــەو دوای بێتووش و هەرزنێ و ئەوشـــەوە لە بێتووش و هەرزنێ ماینـــەوە بۆ بەیانی چووین بەرەو چەمی ســـەفرەو زەروون. چەمەکە باش بوو تۆزێک ووشـــک بوو بەهیـــلاک نەچووین لە زەروون. خوالێخۆشـــبوو کاک تاهیر ووتی کەریم تۆزێـــک کورزەڵەم بۆلێناکەیتەوە هەر چـــوار مەترێک دوور بووم لە کاک تاهیرەوە. لای تۆزێ ئاو سەوزاویدا وویستم کورزەڵە لێ بکەمەوە،وام زانی دارێکی تیایە کە دەســـتم دایە فڕێی بدەم نەمزانی ئەمە دوو مارە لەیەک ئاڵاوە. کە بینیم مارە یەکسەر فڕێم دا. مارەکان چوونە پشت تووترەکەوە گەڵایەکی زۆر چڕ بوو برادەران ڕایان لرد دوورکەوتنەوە. بەڕەحمەت بێت کاک تاهیر بێ ئەوەی یەک تۆزێک تێک بچێ بانگی کردنەوەو ووتی وەرن نـــان و کورزەڵەی خۆتان بخۆن. ووتم کاک تاهیر چۆن بوو نەجوڵای ئەوە مارە ئەگەر پێوەی دای لەم کاتەدا ئێمە چی بکەین، ووتی لە بارزان هیچ مارێک ناکوژن، نەخوازە ماری ڕەش کە پێوە نادا. لەزوربەی ماڵاندا وەک پشیلە ئازادانە دەگەڕێ و مشک ڕاو دەک. مناڵانیان یاری لەگەڵ دەکەن. دوای ماوەی چارەکە سەعاتێک کەوتینەوە نان و کورزەڵە خواردن و بەڕێ کەوتین بۆ گوندی وولاغ لوو. دوای بۆ مالوومە و هێزێکی ســـالار عەزیز

لێبوو خەریک بوو پێکدادا دروســـت ببێت، بەڵام هیچ ڕووی نەدا. ئینجا هاتین بۆ خەمزە لەوێشەوە بۆ سیرەمێرگ دوای هەموو قووەتەکە چووین بۆ گەڕە دێ و لەوێش چووین بۆ دۆڵەتوو. مامۆســـتا جەمال کەمینی بۆ دانابووین بەڵام شـــەهید کاک تاهیر نەی هێشت تەقەی لێ بکرێ و ووتی ئێمە ئامانجی ترمان هەیە نابێت بهێڵین ئاژاوە دروست بێت. هەوڵ بدەن خۆتانـــی لێ دوور بخەنەوە. دوایی چووین بۆ هەوڵ و زەڵان و پارێزان و لەوێ بەکری حاجی سەفەر و ٣ پ.م هاتن بۆ لای کاک تاهیر لە پارێزان لەوێشـــەوە چووین بۆ قولەگیسکە. لە قولەگیسکە شەهید ڕەوفی خەلفە ســـەعید لەگـــەڵ٦ پ.م چوو بۆ ئەوەی کاک حەمـــەی حاجی مەحموود بدۆزێتەوە و ئاگاداری بکات. لەوێشـــەوە ڕۆشـــتین بۆ دۆڵەسوور لەوناوە لە پشـــتی دێکەوە جەماعەتـــی یەکێتی تەقەیان لـــێ کردین بەڵام هەر کاک تاهیر ڕازی نەبوو کە شـــوێنیان بکەوین. ئێمە چووین بۆ قەیەفەری لەپشـــتی ماڵەکانەوە بەلای شاخەکەوەماینەوە ئیتر کاک حەمەی حاجی مەحموود لە ماڵی حەمە دۆڵاشـــی بوو لە گوندی دۆڵاش قووەتەکە لەوێ یەکمان گرتەوە و هاتین بەرەو کانێسکان بۆ مقەڕ دانان.

لە ناوەڕاستیَ ساڵی ٨٠ کاندا هەواڵێکی گەرم هەبوو کە گوایە سەدام بە نیازە نیوملیۆن میسری بهێنیَ بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی دوای چەند ساڵێک زمانی کوردی کەم بێتەوە و ژن و ژن خوازیش دیارە دروست ئەبوو. لەو سەردەمەدا لەناو پێشمەرگەدا ڕاگواستن و هێنانی عەرەب باو بوو، ڕژێم ئەوە ئیشی بوو.

کاک تاهیر وتی ئەم دیاردەیە بەڕاستی ئەگەر ئێمە ڕێگرنەبین لێی، لەداهاتوودا خەتەریاتێکی گەورە ئەبێت بۆ کوردو کوردستان،من و کاکە خەلیفەم لەگەڵ شەهید تایەری عەلی والی بەگ بووین. بەبیستنی ئەم هەواڵانە تەئسیری خۆی هەبوو لەناو ئێمەو هێزی پێشمەرگەدا، کە دوژمن بیەویَ زیاتر خاکی کوردستان داگیر بکات بەبیانوی هێنانی میسری بۆ وڵاتەکەمان . دوای ئەوەی کە کاک تاهیر لەگەڵ کاک قادرجەباری کۆبوونەوەیەکی خێرایان ئەنجام دا، بڕیاریان دا کە دەستەو وەستان نەبن لەم پیلانە . دەبی هەوڵی خێرا بنێن بۆ ڕیگرتن لەوهەنگاوەی دوژمن و هاتنی میسری بۆ کوردستان بەتایبەتی بۆ سلێمانی. بەسەرپەرشتی کاک تاهیر و هەندیَ مەفرەزە بەرەو سلێمانی ڕێگایان بڕی، بۆ ئەوەی هەندیَ میسری بهێنن بۆ ئەو شاخەو لەنزیکەوە پێشمەرگە ببینن و تێیانبگەیەنن کەئێمە خاوەنی کوردستانین، نەک ڕژێمی بەعس. لەهەمان کاتیشدا بەگرتن و مانەوەی ئەو میسریانە لەلای پێشمەرگە دەبێتە هەواڵی ئاژانسەکانی دنیاو فشارێک بۆ حکومەتی میسر و چاوترسانیان، کەمیسریەکان بگەڕێنێتەوە بۆ نیشتمانی خۆیان یان بگەڕێنەوە ناوەڕاستی عێراق،ئەوە لەدوای بڕیاردان شەهیدان کەریمی دادە مەنەو خولەی حەمەتاتەو دەرسیم و سمایلی ئەمنە کۆمەڵێک پێشمەرگەی ئازاو لەخۆبووردو چوونەوە بۆ سلێمانی کە بچن میسری بهێنن،شەهید مەحمود حەمە تاتە گەڕایەوە وتی کاک تاهیر ئەگەر نەهاتن چی بکەین خوالێخۆش بوو تاهیری عەلی والی بەگ وتی بەڵکو هەوڵ بدەن بیانهێنن بەقسەی خۆش ئەبێت ئەگەر بە خوێنی خۆشمان بێ نەهێڵین ئەم پیلانەی دوژمن سەرکەوێت. چوونکە ئەمە خەتەرێکی زۆر گەورەیە بەسەرماندا وردە وردە ئەیسەپێنن. شەهید

مەحمـــود وتی:ئەگـــەر نەهاتن هەرنەهاتن؟ شـــەهید تاهیر وتی:> بیان کوژن، ئیتر مەفرەزەکە بەڕێ کەوتن و لەسـلێمانی ویسـتبوویان چەند میسریەک بهێنن بەڵام بێ سوودبوو هەربەقسەی خۆش و دڵنەوایی کردن و قسـە کردن لەگەڵیان بێ سوود بوو بۆیە ناچار پێنج کەس بوون کارو پیشەیان جیاواز بوو، هەموویانیان کوشتبوو.

ئیتر لەو ماوەیەدا دیاردەی هاتن بۆ کوردستان کەم بوویەوەو ترسێک کەوتە دڵی میسـریەکان کە هەندێکیان گەڕانەوە بۆ ناوەڕاستی عێراق و دەوروبەری بەغداد، هەوڵ و قەرارێکی بوێرانەی شـەهید تاهیر نەبووایە کوردستان بەتایبەتی ناوچەی سلێمانی تووشی تێکەڵ بوونێکی ڕاگواستن و هێنانی عەرەب ئەبوو. ئازایەتی پێشـمەرگەکانیش بوو کەتوانییان ئەو پیلانەی ڕژێم پووچەڵ بکەنەوە بەنەهاتنی میسریەکان ئەگەر بهاتایەو ئەو دیاردەیە ڕێگری نەبووایە ئێستا دەبوو مادەی ١٤٠ یش بۆ سلێمانیمان داوابکردایە بۆ گەڕانەوەی میسـریەکان و لێ کەوتنەوەی دەیان کێشەی کۆمەڵایەتـی کە ڕووی دا بوو لـە ژن هێنان و تێکەڵ بوونی کۆمەڵایەتی و خزمایەتـی ئەوکاتە کێشـەیەکی زۆر گەورەی لێ دروسـت ئەبوو کە چارەسەر کردنی زۆر ئاڵۆز ئەبوو بۆیە جێی خۆیەتی لێرەوە بڵێین هەزار سـڵاو لە گیانی پاکی شەهید تاهیری عەلی والی بەگ و هاوەڵەکانی کە نەیان هێشت ئەو پلانە گڵاوەی دوژمن سەرکەوتوو بێت.

که هێزەکەمـــان یەکیگرتەوە لەگەڵ هێزەکـــەی کاک حەمەی حاجی مەحمود یەکێتی تووشـــی شکســـت بوو لە شـــارەزووردا. بە ڕاستی ئەو بـــاڵا دەســـتیەی نەمابوو لە ناوچەکەدا بە هەبوونـــی ئێمەو هاتنمان، لە دوای بەیەکگەیشـــتنمان هەمـــوو هێزەکان بوون بەیـــەک و یەکمان گرت و بارەگایەکمان لەبناری ســـورێن دانا بە شـــەویش کەوتینە جەولەکردن بەشـــارەزووردا، یەکێتی تاکو ئەهات تووشـــی شـــۆکێکی گەورەببوو تا ئەوکاتـــەی خۆیان وردەوردە کۆئەکردەوە کـــە کتوپڕ پەلامارمان بدەن، هێزەکەمان تێکبشکێنن. بەڵام ئێمە بە دەیەها کادری عەسکەری چاکمان تیا بوو. لەو جۆرە پیلانانە زۆر شارەزاو لێزان بووین. ئەوەی لە ڕاستیدا نەیان ئەوێرا چوونکە کۆمەڵە پێشـــمەرگەیەکی تیابوو پڵنگ ئاسا بوون لەبەرگری کردن. لەبـــەر ئەمانە یەکێتی لەهەوڵی ئەوەدابوو هێزێکی زۆر زۆر گەورە کۆبکاتەوە بۆ لێدانمان، بەڵام شارەزوور ئیستیعابی ئەولەشکرە زۆرەی نـــە ئەکردو ڕژێمیش لە هیـــچ لایەکمانی نەئـــەدا، لەبەر ئەوەی لایەک بێ هێز نەکات بۆ لاکەی تر ئەوەبوو دوو پێشـــمەرگەی شـــەهید ئەنوەری ســـەعیدوالی بەگ کە بە هەڤاڵ دڕندە ناســـرابوو. دوای ئەوەی کە جەماعەتی یەکێتی فەرەیدون حەمە ساڵح دەستپێشخەر بوو بۆ چەک کردنی دوو پێشـــمەرگەی حســـک لە مزگەوتەکەی بیـــوەک. کە زانیمان فەرەیدون ئەم کارەی کردوە شـــەهید تاهیر فەرمانی دا کە مەفرەزەیەکی هەڵبژارد مەفرەزەکە پێک هاتبوو لە شـــەهیدان جەباری عەلی حەوێز و خولە زەردوویی و ئەحمەد سەراوی و حەمەی دەلاک و ئەوانەشی ئێستا لە ژیاندا ماون من و سیروان سەعید و نوری حاجی عەلی و عومەری مام تۆفیق و چەند پێشـــمەرگەیەکی تر. شـــەهید تاهیر وتی بڕۆن فەرەیدون یان هەرچ کەســـێکی یەکێتیدان بەردەســـت کەوت چەکی بکەن، ئەگەر فەرەیدون حەمە ساڵحیش بوو ئەوە باشتر. چووین بۆ گوندی داربەڕووڵە، لـــەوێ پێیان ڕاگەیاندیـــن کە جەماعەتی فەرەیـــدون و ئەوان لە گوندی سلێمانەن. خەڵکی گوندەکە کۆمەڵێک پێشمەرگەیان دیبوو بە شاخەکەدا هەڵگەڕابوون. ئێمەش زۆر بە خێرایی بە شـــاخەکەدا سەرکەوتین بوو بە

تەقە لە بەینماندا، ئیتر لەسەرلوتکەی شاخەکە ڕوبەڕوبوونەوەیەکی قورس ڕوویدا، هێندەی ئەوان شکان و ڕایان کردەخوارەوە، فەرەیدون حەمەسالح گوللە ئاربیجیەکی پێوەناین. من و نوری حاجی عەلی لەتەنیشت یەکەوە بووین ئیتر لێمان دانەوە، ئەوان یەکێکیان لێ بریندابوو نەمان هێشـــت دەری کـــەن ئەویش چاومان لێ بووبەشەلەشـــەل چـــووە ژێر خانێکەوە نەمان هێشـــت لە گوندەکە دەرچن تاکو دنیا تاریک بوو. ئەوەی شایەنی باســـە گوندی ســـلێمانە کەوتبووە شـــاخێکی بەردەلانەوە. ئیتر شەهید تاهیـــری عەلی والی بەگ و ئەوان گەیشـــتن ئێمـــەش چووینە خوارەوە. کەچووینە خوارەوە گرتمان کەســـەیرئەکەین بریندارەکە هاوڕێ کامەران پێنچووێنی بوو، فیشـــەک بەر قاچی کەوتبوو. برینەکەیمان بۆ بەســـت. لەدوای لێکۆڵینەوە لەگەڵیـــدا ناردمانەوە بۆ لای یەکێتی. لەوێ زانیمان کە نەوشـــیروان مســـتەفای لەگەڵدا بووە. دوای ئەوە لە ٢٣ مانگی ١٢ ســـاڵی ١٩٨٠ مەفرەزەیەکی مام ئاراس و قالە چاوشین و باقی برادەران لە گوندی قەویلە نەوشـــیروان مستەفا و حەمەی حاجی سابیر و سامان شـــارەزوریبان هێنا بۆ هۆزی خواجە. لەوێش شەهید تاهیری عەلی والی بەگ و قایەر جەباری و حەمەی حاجی مەحموود و ڕەوفی خەلفە سەعیدی لێ بوو، لەوێ هێشـــتیانەوە. دوای چەند کاتژمێرێک ئیتر مەفرەزەیەکی هەڵبژاردەی دە کەسی لە پێشیانەوە ئەڕۆیشت، بۆ ئەوەی ئەگەر تووشی تەقـــە بیـــن، ئێمە بەر پێکا دانەکـــە بکەوین نەک هێـــزە زۆرەکە، نیوو کاتژمێرێـــک بەینمـــان بوو. لە هۆزی خواجەوە چوویـــن بۆ گوندی دۆڵە چەوتە. ئینجا کە هێزەکەی شـــەهید تاهیری عەلـــی والی بەگ هاتن بۆ ئـــەوێ، ئێمە بەڕێکەوتین بۆ گونـــدی زەردویی. دوای ئەوە ئێمە چووینە گوندی کەولۆس و ئیتر بە هەمان شێوە کە ئەهاتن، ئێمە چووینە گوندی قەویلە. مەفرەزە هەڵبژاردەکەش ژمارەمان دە کەســـێک ئەبووین، پێک هاتبووین لەم برادەرانە.

شـــەهیدجەباری عەلی عەوێز و شـــەهید عەلی کەریم شاهیر و من و سیروان محەمەد و نوری حاجی عەلی و عەلە قەڵەو و عومەر مام تۆفیق

و سەردار مەحمود. ئیتر لەگەڵ جەماعەتی یەکێتی ئەبوو بە شەڕ و چەک کردن، لە هەر شوێنێک پێشـــمەرگەی ئەوان و ئێمە یەکتریمان ببینیایە ئەبوو بە پێکدادان. لای ئێمە کەس ترســـی نەبوو، چوونکە نەوشــــیروان مســـتەفا لەگەڵ هێزەکەدا بوو. بەڵام سالار عەزیز هەوڵی ئەدا کە کێشە دروســـت بکات. بەرپرسەکانی لای ئێمە وایان لێک ئەدایەوە کە ئەو حەز بکات کە نەوشیروان مستەفا تووشی کێشەی جۆراو جۆر ببێتەوە. دوای ئەو جەولە کردنە چووینەوە بۆ لای گوندی شــــانەیەری سەرو لەوێشەوە چووین بۆ ئەشــــکەوتی دەرە گوڵان لای کانێســــکانی ســــورێن. ئیتر ئەو هێــــزە لەوێ مانەوە. خوالێخۆش بــــوو تاهیری عەلی والی بەگ زۆر ڕێزی لێئەگــرت. چووینەوە بۆ بناری ســــورێن گوندی کانێســــکان بەڵام ئێمە شــــەوانە و ڕۆژانە جەولەمان ئەکرد لەشــــارەزوور. ماوەی چەند مانگێک نەوشیروان مستەفا لامان مایەوە لە سورێن لە ئەشکەوتی هەزارئەستوون بوو. هەندێک پ.م هەبوون دەیان وییست شتی بەرامبەر بکەن. هەروەکو گوێم لەقســــەکانی قادر جەباری و خوالێخۆش بــــوو کاک تایەر بوو. کە گوایە سالار عەزیزو ئەوان حەز ئەکەن نەوشیروان مستەفا لە ڕووداوێکی گێژاویــــدا بکوژرێ. وا باس ئەکرا کە دوای ئەو هوودنە دروســــت ئەبێت. ســــالار عەزیز ئەم قسانەی کردبوو کە دەم ئەمان بکەوێتەوە. بۆیە کاک تایــــەر حەزی ئەکرد کە کاکە خەلیفەم نەوشــــیروان مســــتەفا بپارێزێت، نەوەک لــــە لایەکەوە بیکــــوژن. کاک تایەر زۆرجار ئەیوت نەوشــــیروان مستەفا زۆر لە ســــالار عەزیز شۆڕشگێڕترە. کاکە خەلیفەم زۆر بەرگری لــــێ ئەکرد. من کە ئەچوومە خوارەوە بــــۆ جەولە کردن بەتانیم هێنا بۆ ئەشــــکەوتەکەی سورێن. یەکێک بۆ کاکە خەلیفەم و یەکێک بۆ خۆم. کە من ئەچوومە خوارەوە کاکە خەلیفەم بەتانییەکەی من و ئەوەی خۆشــــی ئەدا بە نەوشــــیروان بۆ ئەوەی ســــەرمای نەبێت. خۆشی ئەوەندە پشتی لە ئاگرەکە نزیک کردبووە قەمســــەڵەکەی سووتا بوو. ئەگەر نەوشیروان مســــتەفا نامەیەکی بۆ بهاتایە لە ماڵی جەلالی حاجی کاکەلی لە گوندی شــــانەیەر کاکە خەلیفەم وەری ئەگرت و بۆی ئەهێنا ئەیدایە دەستی لە

ئەشـــکەوتی دەرە گوڵان لە شاخی ســـورێن. کاکە خەلیفەم بەتەنیا زۆر یارمەتی ئەدا. ئەوکاتە شێخ کاوەی شێخ لەتیفیش لەوێ بوو. شەوێکیان درەنگانێکی شـــەو نزیکەی ســـەعات دوو ئەبوو. مـــن لای ئاگرەکەپاڵ کەوتبووم، کاکە خەلیفەم بانگی کردم وتی ئاگات لە خۆت بێت نەوەکوو برادەران چەکمان کەن. وتم بۆ؟ وتی کاک نەوشـــیروان دەرچووە. منیش وتم کە وەکو ئەزانی چەکمان ئەکەن بە توشی پێکدادانێکی گەورە نەبین و نەوەک خەڵکی تیا بکوژرێ. چونکە ئێمە تەنیا هەردووکمانین با بڕۆین. وتی ئێمە بە تەنیا نین جەباری عەلی حەوێز و ئەوانیشـــمان لەگەڵدایە. ئیتر دوای چەند ســـەعاتێک، لەناوماندا دەنگۆی ئـــەوە بڵاو بووەوە کە نەوشـــیروان مستەفا ڕۆشتوە. ئیتر شـــەو هەموو پ.م حسک بە شاخی سوورێن و ئەشکەوتەکانا ئەگەڕان بەشوێن نەوشیروان مستەفادا. ئەوەبوو کـــە ڕۆژ بووەوە دەرکەوت کە دەرچـــووە. دوای یەک دوو ڕۆژ هێزەکەی ســـەعید گوڵپی هاتنە سەرمان بۆ گوندی کانێسکان دووشەو لەوەوپێش نەوشـــیروان مســـتەفا چووبۆوە بۆ ناو یەکێتی ئیتر جاشێکی زۆر هاتنە ســـەرمان ئێمەش لەگەڵ هێزەکەی خۆمان پەیمان هەبوو ئەگەر تووشی تەقە بووین ئەوان دێنە بەدەنگمانەوە، کاکە خەلیفە لە گوندی شیرەمەڕ بوو لەگەڵ تاهیری عەلی والی بەگ و قادر جەباری ئێمەش مەفرەزەیەک هاتینەخوارەوە بۆ شـــارەزوور لەگوندی ڕیشـــێن بووین، کۆمـەڵەجاشێک چووبوونە ئەشکەوتەکانی کانیسکان بۆ سەر ئێمە هاتبوون نەیان زانیبوو ئێمە هاتووین بۆ ڕیشـــێن لەخوار ئەوانەوەین ئەوان سەرشاخیان لەئێمە گرتبوو ئامر مەفرەزەی جاشـــەکان ناوی ســـەعەگوڵپی بوو زۆر ئازابوو، ئیتر بوو بەشـــەڕ کەپێشـــمەرگەکانی ئێمە پێک هاتبووین لە من ونوری حاجی عەلی و شـــەهید جەباری عەلی عەویز وعومەرمام تۆفیق وسیروان ســـەعید جوقلی و ســـەرداری برای و ژیلوانی مـــام تۆفیق وعەلی کەریم شـــاهیر و شـــەهید مەحمود حەمە تاتە وچەند پێشمەرگەیەکی تر. بوو بە شـــەڕ بەڵام چۆن شـــەڕێک کە بە ئاســـانی لەیەک جودا نەئەکرانەوە شـــەڕێکی زۆرقورس کاکە خەلیفەم لەگەڵ شـــەهید تاهیری عەلی والی

بەگ وبرادەران گەیشـــتنە شوێنی شـــەڕەکە کەنیوسەعاتێک ڕێگا ئەبوو لەئێمەوە، مـــن بەبرادەرانم وت هێزمان بۆ بەت ئێســـتا ئەگەن چوونکە لەوەوپێش بەڵێنمان بەیەکتر دابوو لەکاتی تێکهەڵچوونی شـــەڕ فریامان کەون ئەوانیش دڵسۆزانە کەگوێ بیستی تەقەو شەڕی ئێمەبوون هاتن و تەواوکەری هێزەکەمان بوون کەبەڕاستی هەموویانمان لەناوبرد و ئەوەی ماش بەدەستی گیران کەبریتی بوون لەشەش کەس لەدوای لێکۆڵینەوەی شەهید تاهیرو کاکەحەمە و قادر جەباری لەگەڵیان یەک کەسیان مایەوە، کە ئەویش لەڕێکخستنەکانی نهێنی خۆمان بوو. ئەوانی تر بەسزای شۆڕش گەیەنران واتە مەفرەزەکەی ســـەعە گوڵپی کەســـی لێ دەرنەچوو تەنیا یەک نەفەر نەبێ ئێمەش هیچ زیانمان نەبوو بە ســـەلامەتی گەیشتینەوە جێگای خۆمان. ئەوەبوو چوینەوە ئەشـــکەوتەکان و چەند شـــەوێک لە ئەشـــکەوتەکان ماینەوە ســـەرکەوتنێکی باش بوو بۆ هێزی پێشمەرگە. هێزەکەمان لە ئەشکەوتێکا و لەپەنا بەردێکا کەوتینە ئاگرکردنەوە بەشەو زۆر ســـارد بـــوو و زیاتر لە ســـێ ڕۆژ تەنها چامان لابـــوو ئەویش چای تـــاڵ. ڕژێم چاک ئەیزانی ئێمە لەکوێین، ئەگـــەر بڵێم نەیان ئەوێرا بێنە سەرمان زۆر ڕاستە چونکو هەر پەنا بەردێک و دوو پێشمەرگەی لێ بوو هەمووشیان دەست کەرەوەو پێشمەرگەی قارەمان بوون.

له ۲ مانگی ۱ ســاڵی ۱۹۸۱ دوای ئەوەی کە نەوشــیروان مســتەفا گەیشــتبووە ناو یەکێتی ئیتر تۆزێ بارودۆخی سۆسیالیســت و یەکێتی ئاشــتی پێوە دیار بوو. لە ناو حسکدا شــێخ مەنسوور ئامر هەرێم بوو عوســمانی قادر منەوەر جێگری بــوو ئەوکات بەهێزێکــەوە جەولەمان ئەکرد، بەڵام بەڕاســتی بێ ســەرو بەر بوویــن. دوای ماوەیەک هێزێکی نوێ لەناوچەکەدا دروســت بوون و بانگەشــەی حزبیان ئەکرد، بەناوی لەشکری ئیسلامی کورد کە حاجی شێخ قادر بەرپرسیان بوو. ئەم هێزە لەئێرانــەوە هاتبوونەوە بۆ جەولە و چووبوونە ناوچەی دۆڵێ و لەوێوەش بەجەولە هاتبوونەوەبۆ شارباژێر کە نزیکەی سەدوبیست کەسێک ئەبوون هەموویان کلاشینکۆفی موزەڵی سیخۆی نوێیان پێ بوو لەو چەکانەکەش نەبوو، ئێران بەتایبەتی دابووی بەوان.

من و کاکەخەلیفەی برام دوومو‌جاهیدمان شەو لەرێگا ڕۆیشتنەوە لێ چەک کردن و بردمــان جەباری عەلی حەوێزیش موجاهیدێکی لێ بردن، جەبار ئەوەی خۆی نارد بۆ گوندی بزنگیان من و کاکەخەلیفەم دوورمان خستنەوە. دووتفەنگ و تاقمەکەنیان تازەبوو بردمان بۆ ماڵی شێخ نوری لە گوندی گورگەیەر. هەردوو پێشمەرگەکەی ئیسلامیم برد هەرخۆم بووم کاکەخەلیفەم چــووەوە بۆ ناو هێزەکە لە گونــدی چنگیان من نزیکەی شانزە ســەعاتێک شەو دوورم خستنەوە تاکو ئەوبەر چەم، بەرەو ئێران هەردووکیشیانم قەناعەت پێ کردبوو ئێمە لەبەرخاتری ئەوان ئاوا دووریان ئەخەینــەوە چونکە یەکێتــی هێزی زۆری بۆ ئامادەکــردوون هەموویان لەناوئەبات. ئەزانن ئێوە ســەر بەئێرانن دوورم خستنەوە شەو ڕێگام بۆ دەســت نیشان کردن و وتم بەچوار سەعاتێک باش بڕۆن ئەگەنە گوندی بلەکێ و چەمپاراو. ئیتر ئەوان ڕۆیشتن ئینجا خۆم هاتمەوە،ئیسلامیەکان دیاربوو ئەگەڕان بۆ ئەو ســێ پێشمەرگەیە نەشیان ئەزانی لەکوێن ئیتر ئەوان ڕۆیشتن و ئێمەش جەولەی خۆمان ئەکرد.

ڕۆژێکیــان کاکە خەلیفەی برام وتی بابچین تفەنگەکان بێنین. چووین بۆ ماڵی شێخ نووری لەگورگەیەر، بەشێخ نوریم وت کاکە شێخ بەڵکوئەو ئامانەتانە بێنی. کاکە شــێخ چوو کلاشــینکۆفەکانی هێنایەوە، ئێمەش

ڕۆیشتین. کەوتینەوە جەولەکردن لەشــــارباژێر، ئەو شەوە هەرێمەکە لە گەڕەدێ بووین. ئەوەی ڕاستی بێت لەناو حیزبی سۆشیالیستدا پێشمەرگەی زۆر چاو نەترس و ئــــازای لێ بوو بەڵام بێ ئیلتزامی و بەرەڵایی تیابوو. زۆر کات زۆر کات مەشروب خواردنەوەی تیا هەبوو، نەک هەمووی زیاتر لەناو مەسئولەکاندا لە شارباژێر.

دوو قـــاپ عـــارەق هاتبـــوو بۆ ســـیتەک لەوێ شـــێخ مەنســـور و خوالێخۆشبوان جەباری عەلی حەوێز و کاکە خەلیفەم و مەحمودی حەمە تاتە ئەکەونە مەشروب خواردنەوە لە سیتەک لەناوخۆیاندا گفتوگۆ ئەبێ ودەگاتە ناخۆش و شـــەڕ کەوتنەوە لێی و بەگژ یەکتردا چوون. ئەوەبوو مەحمودی حەمەتاتەو ئەوان چەک ئەکرێن هەردوو کاک خەلیفە و جەبار گەڕانەوە بۆ گوندی گەڕەدێ بەئێمەیان وت چەکیان کەن ئێمەش هەرچی جەماعەتی حســـک هەبووچەکمان کردن. بەڕەحمەت بن جەماعەتی مام ئـــاراس ومەحمودی حەمەتاتەو هەموویان چەک کران و، ئەو شـــەوەش یەک دوو پێشـــمەرگەی شـــێخ کاوەش چەک کران. هەرچی پێشمەرگەیە لەشـــارباژێر ئەوشەوە بەشاخەکانەوە مابوونەوە. چوونکە تفەنگەکان زۆر بوون، تراکتۆرێکمان دوای خۆمان کردبوو تفەنگەکانی بکەینە ناو. شـــەو چووین بۆ گورگەیەر، سەعات دوانزەی شەو بوو کەچووینە ماڵەکانی ئەو بەرەوە لای دار و شەخسەکە، لەهەموو لایەکەوە تەقە بوو. شەو چووین بۆ گوندی بزنگیان لەوێشەوە چووین بۆ گوندی وەڵانە. شەو لەماڵی ساڵح ئاغا ماینەوە، بەحساب ببین بەیەکێتی شەو هەموومان هوتافمان هەڵئەدا بەســـەرکۆمەڵە و یەکێتی. بەیانی کەڕۆژ بۆوە کاک شێخ مەنسوور هات و قەناعەتی بەبرا پێشـــمەرگەکان کرد کە بگەڕینەوە بۆ ناو حسک ئەوە بوو ئەوان گەڕانەوە. من و کاکە خەلیفە و شـــێخ کەریمی شـــێخ سەبری چوویـــن بەرەو ســـەرکردایەتی لەڕێگا دیاربوو کەمینیـــان بۆ دانابووین، بەڵام ماوەمان هەبوو ســـوپاس بۆ خوای گەورە تووشـــی هیچ کێشەیەک نەبووین. لای گوندی چنارە ئەوبەر پردەکە ســـێ چوار کەسمان لێ دی لەسەرگردەکە بوون، هەرئەش بێ لەو پردە دەست کردەوە بپەڕینەوە کە دوو داربوو پردەکە. کاکە خەلیفە لەمبەر پردەکە مایەوە، منیش چوومە

ئەوبەر، کەپەڕیمەوە یەکسەر بەرەو گردەکە چووم، بەڵام ئەو سێ کەسە دیار نەبوون تاگەیشتینە سەرکردایەتی. لای کاک نەوشیروان بەخێرهاتنی گەرمی کردین و لەوێ چەند ڕۆژێ میوانی بووین. دوای چەند ڕۆژێک لەگەڵ مولازم عومەر بەهێزێکەوە لە دۆڵێوە هاتینەوە بۆ شاربازێڕ. غەریب کونجرینی جێگری کاکە خەلیفەم بوو، ئێمە هێزێکی زۆربووین چوونکە هی قەراغ و گەرمیان هاتبوو بۆ حاجی مامەند لەوێ شەڕێکی قورس ڕووی دا لەبەینی پارتی و یەکێتی بەڕاستی زۆربەی پێشمەرگە ئەوکاتە پێیان ناخۆش بوو بەس شەڕەکە زیاتر جەماعەتی گەرمیان و مام ڕۆستەم هەڵگیرسێنەری بوون. پارتی لەناوچەکە دوورکەوتنەوە.

دوای ماوەیەک هێزەکە گەڕایەوە بۆ سەرکردایەتی. مولازم عومەر جەماعەتی شەهید تاهیری حاجی عەزیزی داینێ کە لەگەڵ کاکە خەلیفەم دا بێ بۆ جەولەکردن. ئەوەبوو کەوتینە مەفرەزە کردن بۆ ناو شار هەموو کار و ڕاسپاردەکانمان زۆر بەدڵسۆزانەو هێمنانە ئەنجام ئەدا و لەهەموو چوون و هاتنەوەیەکماندا بە سەلامەتی ئەگەڕاینەوە جێگای خۆمان . دوای چەند ڕۆژێک کاکە خەلیفەم پێی وتم کارێک هەیە لەسلێمانی بچۆ بەڵکو ئەنجامی بدەی. من و عومەری شێخ ڕەحیم و حسێنی حاجی غەریب، ڕازی بووم. بۆ چەند چالاکییەک چووینەوە بۆ سلێمانی، شەو گەیشتینەوە سلێمانی ئێمە دوو تفەنگی موزەلیمان پێ بوو، تفەنگێکی ترمان لە فەلاحی حەمەی زەینەب وەرگرت بۆ شەهید حسین حاجی غەریب. لەماڵێک بەرامبەر ماڵی عومەری شێخ ڕەحیم ماینەوە. هەرسێکمان بووین سێ کلاشینکۆفمان پێ بوو. بەڕێکەوت ماڵەکە باری قاچاغی لێ بوو،عەسرەکەی خەریک بوو پۆلیس بێتە ئەو ژوورەی کە ئێمەی لێ بووین. خوای گەورە ڕزگاری کردین ئەگینا وا نەبووایە دەبووایە دەستمان لەپۆلیسەکان بکردایەتەوە. بۆ شەوی دووەم چووین بەرەو گەڕەکی ئیبراهیم پاشا، دیاربوو ڕژێم پێی زانیبووین، وادیاربوو پیاوخراپ هەواڵیان دابوونێ. شەو چووین بۆ ماڵی یوسفی مروور. من نەمئەزانی ئەوکاتە یوسفی مروور تەنزیمی شۆڕش بوو. دوای چەند چرکەیەک بوو بە تەقە لەهەر چوارلاوە، ئێمەش هیچ خۆمان

تێکنەدا و من چووم لەســـەربانەوە زۆر بە وریایی تەماشام کرد، ئەم لاو ئەو لا خەڵکی چەکداری لێ بوو، بەس دووربوون لەئێمە. خوشـــکەکەی یوسفیش بریندرابوو، بەشووشەی ماڵەکەیان. ماڵی یوسف خۆشبەختانە تووشی هیچی تر نەبوون. خانوەکەیان دوودەرگای هەبوو، ئێمە لەدەرگای ســـەرجادەکە کە زۆرتاریک بوو هاتینە دەرەوە، تەقەمان لێ کردن. ئیتر ڕێگامان بۆخۆمان پاک کردەوە جەماعەتی ئەمن شـــکان سەیارەکەشیان بەجێ هێشـــت. ئێمەش ئەو شـــەوە گەڕاینەوە بـــەرەو هەوارەبەرزە، بۆ بەیانی حەســـەنی حاجی غەریب وابزانـــم مەحمودی حاجی غەریب برای شەهید حسین کەلەگەڵمان بوو هاتن بۆ ئەو ماڵەی کەلێی بووین. بەڕۆژ مابووینەوە لەســـلێمانی هەندێ قســـەمان کرد لەگەڵ یەکداو دوای چەند سەعاتێک ئەوان ڕۆیشتن، هەستم ئەکرد کە شتێکی گەورەمان بەسەردێ.

شـــەهید حســـێن وتی شـــەوێ ئەچینەوە دەرەوە بۆ ئەو ئیشەی بۆمان دیـــاری کراوە. هاتینە خـــوارەوە بۆ لای ئیبراهیم پاشـــاوە بەڵام پێش ئـــەوەی نزیک ببینەوە کارەبای ئەو ســـێ کۆڵانە کوژابـــووەوە. من زۆر دڵنیابـــووم کە ئەمە کەمینەو بۆ ئێمەشـــە، چونکە ماوەیەک پێش ئەوە کەمینیان دانابوو بۆ شـــەهید جەلالە سوورو شـــەهید غەفورە جووجەو فەلاحـــی حەمەی زەینەب. فەلاح بـــۆی گێڕابوومەوە کەدوژمن فێر بوون لەنێو ســـتارەی ماڵەکاندا کەمین دائەنێت. من دڵنیابووم کەکەمین هەیە بەڵام شـــەهید حســـین قەناعەتی نەبوو کە کەمین هەیە، من بە باشـــم زانی بـــۆ ئەوەی برادەران نەڵێن ترســـاوی خۆم پانـــزە مەترێ لەپێش عومەری شـــێخ ڕەحیم و شەهید حسێن حاجی غەریبەوە ئەڕۆیشتم، من یەکەم کـــەس بووم کە چووینە کۆڵانە تاریکەکـــەوە، دووەم عومەر بوو سێیەم شەهید حســـین بوو. جامانەکەم خستە ملمەوە کڵاوەکەم خستە گیرفانم و قایشـــی کلاشـــینکۆفەکەم شـــۆڕ کردەوەو خستمە ملم. میلی کلاشینکۆفەکەم ڕاکێشاو زانیم کە تووشی تەقە دەبین. بەبن دیوارەکەدا ئەڕۆیشـــتم بۆ ئەوەی هەر لە یەک لاوە تەقەم لێ بکەن، واتە بەس تەنیا لە ڕیزی ســـتارەی ماڵەکانی ئەوبەرەوە تەقەم لێ بکەن. ئیتر کاتێکمان زانی لە هەر چوار دەورمانەوە لەسەرستارەی ماڵەکانەو کەوتنە تەقە لێ

کردنمان. زۆربە خەســـتی بەئاربیجی لێیان داین، یەکسەر لێم دانەوە زۆر بەباشـــی چوونکە زۆر بەحەزەرەوە ئەڕۆیشتم. ئەو شەش حەوت کەسەی لەسەر سوچەکە بوون ســـەیارەیەکی شۆفرلێتیان دانابوو لەمنەوە نزیک بوون. داوایان لێ کردم تەســـلیم بم. منیش بەرەو ڕوویان چووم و یەک مەخزەنی چلیم پێوە نان. تا تفەنگەکە خۆی ڕاوەستا ئینجا مەغزەنێکی ترم تێکرد. عومەرشـــێخ ڕەحیم بانگی کردم و وتـــی بریندارم. وتم کوا حسێن؟ وتی حسێن کوژراوە.

شەهید حسین بەرکەوت و عومەرشێخ ڕەحیمیش بریندارببوو، بەرپشتی کەوتبـــوو لەگەڵ قاچـــی. جەماعەتی تەواری پانزە کەســـێک زیاتربوون ئەیانویست ئێمەش شەهید بکەن و دەرباز نەبین. تەقەش هەر بەردەوام بوو. لەڕاستیدا ئەوان خۆیان زۆر بە موسەیتەر دائەنا، داوایان لێ ئەکردین خۆمان بەدەســـتەوە بدەین بە وەعدی شەرەف هیچمان لێ نەکەن. بەڵام من بەرامبەر ئەوان لەهەر شوێنێکەوە تەقەیان لێ بکردمایە لێم ئەدانەوە بەباشـــی. لەدوایدا ئیتر عومەرم دا بەشانمداو بەپەلە بردم بەرەو کۆڵانی ئەودیوو. جار جار بەپەلە ئەگەڕامەوە سەریان ئەوانیش خۆیان ئەکرد بە ماڵەکانا. منیش ئەمویســـت زوو دوور کەومەوە، عومەرم ئەدا بە شانمداو ئەڕۆیشـــتم. عومەر قاچی زۆر خوێنی لێوە ئەهـــات، ئاواها بیبەمەوە بۆ شارباژێر ترسی ئەوەم هەبوو لە ڕێگا بمرێ بە دەستمەوە. چووین دامان بەسەر داروتەڵەبەیەکدا چوومە ژوورەوە پێم وتن هەرچ کەسێک لە شوێنی خۆی بجووڵێتەوە ئەیکوژم هەموویانم خستە سوچێکی حەدیقەکەوە تفەنگم لێ ڕاکێشان وداوام لێ کردن کە سارخی و دەرمانم بۆ بهێنن لەگەڵ حەب ورد وردی بکەن بیخەنە ســـەربرینەکەی عومەر. خوێنەکەی گیرسایەوە، دوای ئەوە دامەوە بەسەرشـــانمدا و بەگۆیژە دا سەرم خست و چووینەوە بۆ شـــارباژێر، بەڵام بەڕاستی زۆر زۆر هیلاک بووم کەبرینداریکیشم پێیە بەتەنیا خۆشـــمم بەو شـــاخە ســـەری بخەم. بەڵام زۆربەداخەوە شەهید حسێن شـــەهیدبوو زۆرخەفەت باربووین بەو بارودۆخە ناخۆش و کۆست کەوتوویە. لەتۆڵەی ئەوەی ئەوان شـــەش حەوت کەسێکیان لێ کوژرابوو لەگەڵ برینداریشـــیان هەبوو، شەهید حسێنیان بە دوای سەیارەی قوەت

خاسەدا ڕاکێشابوو. ئەوەی شـــایەنی باسە مولازم موحسین جێگرەکەی خۆی ناردبوو لەگەڵ ئەو مەفرەزەی قوەت تەواریەکەدا. بۆ شەوی دوایی مەفرەزەیەکی هاوبەشـــی بەهێز چوونەوە ناو شـــاری سلێمانی کە پێک هاتبـــوون لە کاکە خەلیفەم و شـــەهید جەزای کـــەوێ و مەفرەزەکەی و لەگەڵ جەماعەتی شـــەهید تایەری حاجی عەزیز. دوای شەڕێکی سەخت شەش کلاشینکۆف دەسکەوتی برادەران بوون لەتۆڵەی شەهید حسێن .
دوو ڕۆژ دوای ئەوە حەسەنی حاجی غەریب برای شەهید حسێن و دلاوەرو بورهانی خوشـــکەزای ناردبووە دەرەوە. ئێمەش لەبەر خاتری شـــەهید حسین کردمانن بەپێشمەرگە بەڵام بورهانمان ڕەوانەی سەرکردایەتی کرد یان بچێ بۆ ئێران.

ئیتر کەوتینەوە جەولەکردن لەناوچەکەدا، چووین بۆ گوندی خەراجیان بەنیازی ئەوەی دەســـتێک بووەشـــێنین یان لەقافڵەی سەربازگایەک یان دەسکەوتنی پیاوخراپان کەوەکو چالاکیەکی گەورەخۆمان بۆ ئامادەکردبوو کەوەکو وتم دەســـتێکی گـــەو.رە لەدوژمن بووەشـــێنین، ئەوەبوو چەند کەســـێک کەوتە بۆسەکەوە هەندێ تەق و تۆق دروست بوو بەڵام بەدڵی خۆمان نەبـــوو دوژمن ڕای کردو بـــەرەو عەربەت ئێمـــەش هەرماینەوە لەسەرجادەکە لەئەنجامدا سێ هندیمان تووش بوو بەگەڵابەی ئاخچەمەوە، بردمانن بۆ شارباژێر بەخۆیان ولمەکەوە دوایی هەندێکمانماینەوە هەزار کەسێک ئەبوو،باســـی شۆڕشمان بۆ جەماوەرەکە کرد، کە پشت نەکەنە میللەتی خۆیان بەدڵ و بەگیان لەگەڵ شـــۆڕش و پێشمەرگەدابن. دوای گەڕاینەوە بۆ ســـنووری ناوچەکەی خۆمان، شـــارباژێر. ئیتر دوای چەند ڕۆژێـــک هندیەکانمان ئازادکردن کەلامان میـــوان بوون و ناردماننەوە بۆ سلێمانی خۆشمان چووین بۆ سەرکردایەتی، کەسەرکردایەتی بەنووسراو داوایان کردبووین.

ئەو سەردەمانە مل ملانەی هێزو قووەت بوو بۆ حیزبەکان هەر حیزبەو بەلای خۆیدا ڕای ئەکێشــا، ماوەیەک بوو حســک لەناوچەی بالیسان و دۆڵــە ڕەقدا ژمارەیان زیادی کردبوو. پارتیش لەنزیک دۆڵی شــەهیدان و قەندیــل بوون. حیزبی شــوعیش زۆر بە حەزەر بــوون لە یەکێتی و متمانەیان نەئەکرد بە گفت و بەڵێنیان. حکومەتیش تەماشاکەرێکی باش بوو کەی ئێمە بکەوینە یەکتر بڕینەوە، کوردســـتان کەوتۆتە نێوان چوار دەوڵەتی داگیرکەرەوە هەر دەوڵەتەی کێشەی بەشە کوردەکەی بندەستی بە کێشــەی هەرە مــەزن و مان و نەمانی کیانەکانــی خۆیان دەزانن و دەشــزانن کە بەرەو پێشچوون و ســەرکەوتنی خەباتی رزگاریخوازانەی هەر پارچەیەکی کوردســتان بەقازانجی گەشەو بەرەوپێشچوونی خەباتی کوردایەتــی لە پارچەکانــی دیکەدا و ژیانی ئەوان تــەواو دەبێت، بۆیە هەمیشە لەبەردەم خەتەری جدی کوردو کوردایەتیدا یەکدەگرن و بەرنامە و پلانیان یەک دەخەن، ئەوە وای کردبوو کە دەرفەتی درزکردنە ناخۆمان و بەهــەر هۆیەک بێت هەر پەل هاویشــتن و کۆمەکــێ دەبێ لە ڕێی و ڕەزامەندی و ژێر ڕەحمەتییەکی لەو داگیرکەرانە بێت و کە حەتمەن هەر مەمرەو مەژی دەبێت تا ئەو کاتەی کە بەرژەوەندی خۆی تێدا بەدی بێت. ئێمەی کوردیش ئەم هەموو پێشمەرگە ڕەش و ڕووتە پۆڵاینە هەر حیزبەو بەشێوەی خۆی پەروەردەی ئەکردین بەڵام تۆزێ بیرمان لێ بکردایەتەوە کــورد بوونەکە بوو کــە هەموومانی لە ژێر یەک چەتــردا کۆکردبووەوە لەناو شــاخەکانی قەندیل کە هیچ دوژمنێــک و ئەمریکاش نەی ئەتوانی بەســەرماندا زاڵ بەبێت ئەگەر بڵێم تاکی پێشــمەرگەی ئەو سەردەمانە مەگەر مردن ئیســراحەت بدات بە لەشــمان. ئێمەی پێشمەرگە ئەوەندە شاگەشــکە ئەبووین بە شــەڕی داگیرکەران، زۆر جار داگیرکەر خۆی بۆ نەئەگرتین هەندێ جار ئەگەر بە ســوتفە یەکێکیان نەبردایە زۆر عادز و پەســت ئەبوو، بەڵام زۆربەمان کە لە شــەڕێکی یەکتردا بەشدارئەبووین زۆر نامورتــاح و دڵ تەنــگ ئەبووین دوای ئەو شــەڕانە تاماوەی چەند ڕۆژێکیش خەم باری دای ئەگرتین. ڕۆژێکیان مام جەلال بە کاک نەبەزی

ووت، بیســـتومه شـــەڕی ق.م ناکەی، ووتی کاتی خۆی لە بۆم کردووی ئێستا نایکەم. خوێنەرانی خۆشەویست وویستم زۆر بە کورتی باسی ئەو سەردەمەتان بۆ بکەم.

لەگەڵ نەوشیروان مستەفا بەرەو گوندی بێدەڵان و ئاڵی ڕەش و مارە دوو ڕۆشـــتین و لە ڕەزڵە و توتمە لە بناری قەندیل ئەوشەوە ماینەوە و دوایـــی . بەڕێ کەوتین بۆ دۆڵەڕەقە و پڵنـــگان و مەلەکان کە هەرێمی ١٤ لێ بوو فەرماندەی هەرێم ســـوار ئاغا بوو. ماوەی دوو مانگێک لەوێ ماینەوە.

ســـێ ئافرەت فەرمانی گرتنیان بۆ دەرچووبوو لە زانکۆی هەولێرەوە هاتبوون بۆ دەرەوە نەئەکرا لەگەڵ ئێمەدا شەوان بەو شاخەوە بمێننەوە، کاکە خەلیفەم پێ ووتم بەڵکو ئەو ســـێ ئافرەتە بەری بۆ سەرکردایەتی منیش لەگەڵ دوو پێشـــمەرگەی تردا وەستا کەمالی برای مەجید گورگەو پێشـــمەرگەیەکی تر چوین بەرەو سەرکردایەتی. جەماعەتی عەبدولا بۆر چەنـــد ڕێگەیەکیـــان لێ گرتبووین. بەڵام ئێمە مـــاوەی ٢٠ ڕۆژ دەنگمان نەبوو بۆیە خەبەریـــان دابوو کە عەبدولا بۆر و جەماعەتەکەی کەمینیان بـــۆ داناویـــن و کوژراوین. برادەران زۆر بێ تاقـــەت بوبوون بەڵام من بە ڕێگەدا نە ئەڕۆیشـــتم تەنها بە لاڕێدا لەبەر ئەوە سەلامەت بووین. لەوێ چەنـــد ڕۆژێک مامەوە مولازم عومەر ئاگاداری کردم کە نەڕۆمەوە جارێ. ئەوەبوو مولازم عومەر و هێزەکەیم هێنایەوە بۆ ناوچەی قەندیل و ڕەزڵەو توتمە بەشـــەو هێزەکە سەد کەســـێک ئەبوو.من شارەزاکەیان بووم. بەو شـــەوە نەم هێشـــت یەک کەس بەجێ بمێنێ، هەموویانم بەســـەلامەتی هێنایـــەوە بـــۆ ڕەزڵەو توتمە. دوایـــی بەرەو دۆڵی شـــەهیدان دواتر بۆ چالاکییەک بە فەرمانی مولازم عومەر ناردمیە موجەمەعی بەستەســـێن. مەفرەزەیەکی چوار کەســـی بووین چووین بۆ موجەمەعی بەستەســـێن. ماڵانی تەنزیمی خۆمان هەبوو مولازم عومەر پێی وتم لەو ناوچەیە هەندێ دزی کـــراوە. ماڵەکە تەقریبەن ئەیانزانی کێ دزی لێ کردوون. وتی بچۆ بزانە کێیە و چۆن ناســـیویانە، تەکیدیان لێ بکەرەوە با کەسی خەڵکی

ناوچەکـــەت لەگەڵدا نەبـــێ، لێ کۆڵینەوەیان لەگەڵـــدا بکە و ناوکانیانم بۆ بنووســـەو بۆم بێنـــەرە، بەس نابێ کەس بزانـــێ. ئەوەبوو چووم بۆ موجەمەعەکەی بەستەسێن، ئەوشـــەوە لەوێ مابنەوە. بۆ سبەی ئێوارە بردیانم بۆ ماڵەکەو لەدورەوە پیشانیان دام و منیش لەگەڵیانا دانیشتم و هەندێ پرسیارم لێ کردن و پیاوی ماڵەکەو ژنەکە و منالەکان جیابەجیا پرسیارم لێ ئەکردن. ئەو شتانەم نوسی ئەوەی کەئەوان وتیان،ئیشەکەم زۆر بەباشـــی تەواو کرد. کـــە بەرێ کەوتینەوە بـــۆ قەڵاتوکان، چوومە دەشتەکەو لەئۆردوگاکە دوور کەوتمەوە .دیار بوو کەمینێکی گەورەیان بۆ دانابووین، دیارە ئاگادار کرابوونەوە کە ئێمە هاتوین و خەڵکی ســلێمانی کە چوار کەســـین ئەوەی کە لەبیرم مابێ لەگەڵ هاورێ جەبارو سەردار و ئـــاوات و من. لای پردێکی بچکۆلەوە پێنج شـــەش رۆناکیم دی، زانیم کە کەمینەو بۆ ئێمەشـــە . بەبرادەرانم وت کەمینە، ئێمە چوار پێشمەرگە بووین. جەماعەتی ئیبراهیم ئاغا و عەســـکەری ئەوناوەیان لێ گرتبووین. من ئەوناوە زۆر شـــارەزا بووم، راوەستام و بەبرادەرانم وت ئەوە کەمینە بۆ ئێمەیە . لەم قسەو باســـەدا بووین چوار پێشمەرگەی نەسرەدین ئاغا هاتن ئەوانیش لە لەئۆردوگاکە بوون ئەم ناسین نهێنیمان یەک بوو، هاتن بۆلامان وتیان ئەوە بۆ راوەستاون؟ وتم وەڵا کەمینە، نیوسەعاتێک دوور ئەکەوینەوە دوایی لەپشـــتەوەلێیان ئەدەین و ئەوکاتەش پشـــتمان بەو شاخەیە، ئێمەسەرکەوتنێکی زۆرچاک بەدەست ئەهێنین. ئەمان باوەڕیان نەکرد یەکســـەر هەر چواریان رۆیشـــتن. من دووبارە وریام کردنەوە کە بەچـــاوی خۆم دیومن، چوونکە مانگە شـــەو بوو زۆر رووناک بوو. بەڵام دیاربوو قەناعەتیان نەبوو هەر رۆیشتن. یەکسەر نزیک پردەکە بوونەوەو لێیاندان. دوانیان شـــەهید بوون و دووانیشـــیان برینـــدار بوون. ئێمەش لێمـــان دانەوەو زۆر بەزەحمەت دەرچوویـــن نەمانتوانی بریندارەکان لەو کاتەدا دەربکەین. دوای ماوەیەک بریندارەکان هاتنەوە بۆ لای نەسرەدین ئاغا. ئێمەش زۆر بە فەلاکەت دەرچووین چونکە لە زۆر شـــوێن کەمینی عەســـکەری و جاش هەبوون، لە رێگا ســـەرەکیەکان. بەڵام توانیمان لە

بەینی کەمینەکانـــەوە بگەڕێینەوە بۆ بارەگاکانی خۆمان، بۆ لای مولازم عومەر. مولازم عومەر لە ئەنوەر حەسەن و عەبدول ڕەحیم کە فەرماندەی کەرت بوو تورە بوو بوو کە ئەوان وتبوویان هەرچواریان شـــەهید بوون، بەهاتنەوەمـــان مـــولازم عومەر زۆر پێی خۆش بوو کە ســـەلامەتین. لە ســـەرەتاوە ڕووداوەکەم بـــۆ گێڕایەوە کە چۆن بووە و ئـــەو کارەی کە بەمنی ڕاســـپاردبوو بۆم باسکرد و بەدوور درێژی وەزعی ئۆردوگاکەم بۆ بـــاس کرد و نـــاوی ئەو دزو جەردانەم دایە کە لـــەو ناوچەکەدا دزی و تالآنی لە خەڵکی دەکەن و ترس و دڵە ڕاوکێیان خستوەتە دڵی خەڵکی ئۆردوگاکە.

دوای چەند ڕۆژێک من و کاک ســـەلاح چاوشـــین چوینەوە خوارەوە بۆ مجەمەعی بەستەســـێن دوای چەند سەعاتێک هێزێکی عەسکەری زۆر ئەوناوەیان گرتبوو بۆ گرتن یان لەناو کوشـــتنی ئێمە. ئێمە هیچ چارمان نەبـــوو نەمان ئەتوانی بگەڕێینەوە بۆ قەندیل. لەبەر ئەوەی ناوچەکە زۆر بەچڕی گیرابوو بۆیە بڕیارمان دا کە بچینە نزیک مقەڕی لیواکەوە. ماڵی دوو بـــرای لێ بوو ســـڵاوی مام جەلالمان پێگەیانـــدن ئەوەبوو جێگایان کردینـــەوە، ماڵەکان تەنها ٥٠ مەترێک لە مقـــەڕی لیواکەوە دوور بوون بەڕۆژ هەموو عەســـکەریەکە لەبەر ماڵی حاجی عەلی بوون، براکەی ناوی مەحمود بوو.

ئەوەبوو تاکوو دوو شەو ڕۆژ نەمان توانی بێینە دەرەوە تاکو جەیشە کە گەڕانەوە ئینجا شەوی سێیەم هاتینە دەرەوە بەرەو قەندیل ڕۆشتینەوە برادەران زۆر دڵ خۆش بوون کە بەسەلامەتی گەڕاینەوە.

هێزەکەمان زیاتر لە سـەد کەسێک ئەبوو کە مولازم عومەر بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری و سەرپەرشتیاری هەموو پێشمەرگەی یەکێتی بوو، ئەم بەرپرسانەشـی وەکو ئامر کـەرت لەگەڵدا بووە کوێخا محەمەد مەلا شـەریف کە بەکوێخا ڕینگۆ بەناوبانـگ بوو پیاوێکی زۆر ئازابوو، کوێخا عەلی مەنگووڕ و لەگەڵ نەسـرەدین ئاغا و هۆمەرئاغا و خوالێخۆشـبوو شـێخ دارای شێخ جەلال و شەهید جەلالی حەمەی محە و خوالێخۆشبوو حەمـەی ئامـۆزا و بەکری پیرۆت و چەندین پێشـمەرگەی تر بە جیهاز ئاگامان لەوهێزانەی ئەولابوو کەکاک نەوشـیروان سەرپەرشـتی ئەکرد، بـەم دوو هێزەوە ئەبووایە حسـک و شـیوعی و قیادەموەقەتەمان لەو دۆڵەی شەهیدان وەدەرنایەو ناوچەکانیان جێ هێشتایە، ئێمە بەم هێزەوە پشتیان لێ بگرین ئەوانیش لەناوچەی ئۆرتیوە بۆیان بێین ئیتر شەڕەکە زۆر نەبوو ئەوان خۆیان کێشایەوە بۆ شاخەکان وشەڕێ وا دروست نەبوو بەس کۆمەڵێکی حسـک مابووە ئەویـش عەبدوڵلا بۆر بوو بەڵام لەبەری ئەوبەر کۆمەڵەکەی عەبدوڵلا سـوور چەک کران و عەبدوڵلا سـووریش شەهید بوو .

ئیتـر من و ئەوچوار پێشـمەرگەی کەلەگەڵم بوون چووینەوە بۆ لای کۆمەڵەکەی خۆمان لای کاکە خەلیفەم کە لەگەڵ کاک نەوشـیروان بوو لـەوێ یەکمان گرتەوە و من و کەمال برای مەجید گورگە و خەباتی مەلا عەبـدول و هەندێ برادەری تر. دوای چەنـد ڕۆژێک گەڕاینەوە ناوزەنگ بۆ سـەرکردایەتی. لەوێ چەند ڕۆژێک ماینەوە لەگەڵ کاکە خەلیفەمدا. دوایی ئەوەی کە دە ڕۆژێک لە سـەرکردایەتی ماینەوە بە هێزێکی حەفتا کەسییەوە چووین بۆ ناوچەی دۆڵێ، مەلا بەختیار سەرپەرشتیاری ئەکرد. کە بۆ ناوچەی دۆڵێ و سـەرگەڵو ئەچووین لە چیای ئاسۆسـەوە بەڕێ کەوتین تاکو گەیشـتینە چنارە. لەوێ لەگەڵ شەهید جەمال عەلی پاپیر یەکمان گرتەوە. بەو هێزەوە چووین بۆ سـەرگەڵو، لەوێ شێرزادی شێخ عەلـی لەوێ بوو. دیاربوو هێزەکەی ئێمەی بە باش نەئەهاتە پێش چاو. وادیارە هەر شەو چوو بوو بۆ لای شەهید شێرکۆی برای. ئاگاداری کردبوو

کەئەم هێزە بۆ ئەو هاتوون. بەڵام دیارە شەهید شێرکۆ باوەڕی نەکردبوو شێرزادیش دیار بوو دڵنیا بوو کە ئەو هێزە هاتوون بۆ شەڕکردن لەگەڵ شـــێرکۆی برای بەڵام دیسان شەهید شـــێرکۆ وتبووی من لەگەڵ جەمال ڕێکەوتنمان ئەنجام داوە کە هاوکاری یەک بین، شێرزاد بە عادزی لەوان دوور ئەکەوێتەوە دوایی شــــەهید شێرکۆ کە ئەو ئەڕوا ئەڵێت ئەم برایەم جارناجارێک ڕەئی ڕاســـتە ئێمە بۆ ئیحتیاتی خۆمان ئەگەر شکم کرد کە نیازی خراپیان هەیە ئێوە حەزەری خۆتان بکەن، ئیتر دوای ماوەی چەند سەعاتێک شەهید جەمال و پێشمەرگەکان ئەگەنە ئەوێ، ئەوەی شایەنی باســـە برادەران باوەڕیان بە شـــەڕەکە نەبوو ئەگەر باوەڕیان بەشەڕەکە بووایە یەک پێشمەرگەی حســـک دەرنەئەچوو. چوونی ئەو هێزەی ئێمە خۆی لەخۆیدا پرســـیار بوو بۆ شەهید شێرکۆ. شـــەهید جەمالی عەلی باپیر و شەهید شێرکۆ دۆستایەتیەکیان هەبوو پەیمانیان بەیەکتری دابوو کەلەکاتی لێ قەوماندا هاوکاری عەسکەری یەکتر بکەن.

ئێمەش بۆ بەیانی بەو هێزەوە چووین بەرەو سێکانیان. شەهید شێرکۆ لە ســـێکانیانەوە بوو بارەگاکەیان، لەسەر ئاوێک بوو لەگەڵ مەلابەختیار کۆبوونەوەیان کرد و شەهید جەمال و پانزە پێشمەرگەیەک چوون بۆلای بارەگاکەی شـــەهید شـــێرکۆ. ئیتر ئەگەنە ژێـــر کەپرەکەو دوای چاک و چۆنی بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت پێشمەرگەکانی کە لەگەڵ شەهید جەمال بوون باوەڕیان بەو شـــەڕە نەبوو، شـــەهید جەمال دەم و چاوی تێکچوو بوو یەکـــەم جار کەس تەقەی نەکردبوو، دووهـــەم جار بە دەنگی بەرز وتبووی شـــوێنەکەیان زۆر خۆشە و خۆی کڵاشـــینکۆفەکەی ڕاکێشابوو شـــەهید شێرکۆی شەهید کردبوو یەکســـەر بێستوونی برای شێرکۆ یەک ڕیز ژێســـێ ئەنێت بە پشـــتی جەمالەوە یەکسەر جەمال کوژراو ئیتر بوو بەدەست ڕێژ لە ژێر کەپرەکەو لەئەنجامی ئەو شەڕی خۆکوژییەدا ئەمانە شەهید بوون.

ئەو پێشـــمەرگانەی کەناوەکانیانم لە یاد ماوە ئەمانەبوون: شـــەهید جەمال خۆی، شەهید سمایل گەورەدێی، شەهید حسن قارەمان، شەهید

ئەوشـــیروان، شـــەهید ئەنوەرعەبەی مەلاســالّح، دانای ئەحمەد مەجید وبەختیـــاری حەمەی محە عومەر چاوشـــین و خولەی حەمەجان ئەوانی دیکە هەمووی شەهید لەو شەڕەدا. کۆمەڵەی حسک واتە شەهید شێرکۆ، شـــەهید بێستون وچەند پێشمەرگەیەکی تر لەوبەر شەهید ببوون. تەنیا قالەی قەســـاب و شـــێرزادی شـــێخ عەلی دەرچووبـــوون، ئەوانی دیکە هەموویـــان کـــوژران. بەدڵێکی زۆر خەمبارەوە بۆ ئـــەو هەموو قارەمانە شەهید بوون. هەموو ئەو شەهیدانە بە ڕاستی خەسارەتێکی زۆرگەورەبوو لە کورد کەوت. شایەنی باسە کە شەهید ئارازی شێخ عەلی (برای شەهید شـــێرکۆ) لە هەکاری شەهید بوو. ئیتر تەرمەکانیانمان هێنایە خوارەوە و بردمان لە مزگەوتەکەی سێکانیان ڕیزمان کردبوون.بەڕاستی ڕۆژێکی زۆر ناخۆش بوو بۆ هەمووان. شەهیدەکانمان بەئێستر برد بەرەو دێی مالومە، لەوێ بەخاکمان ســـپاردن. ئیتر لەو ناوچانەماینەوە بەڕاســـتی خەڵک زۆر نیگەران و بێزاربوون بە بارودۆخی ئاڵۆزی نێوانی شـــەڕی براکوژی. نەشـــیان ئەوێرا دەنگ هەڵبڕن بۆ دەســـت هەڵگرتن لەو خوێن ڕشتنە، پێیان بڵێن دوژمن بەو هەموو توانا گەورەیەوە کورد لەناو دەبات، لەشار و دێهاتـــەکان. ئێوەش دەنگێکی ئەو خەڵکە زوڵـــم لێ کراوەن. خۆتان لەناوخۆتاندا یەکتر لەناودەبەن .کە هەموو ئەمانە بێ سوودبوو، چوونکە لەپێشـــمەرگە وا گەیەنرا بووکە ئەمانە دوژمن بەکـــورد و ڕێبازەکەمانن دەبێ لەناویان بەرین!!!

دوای چەند ڕۆژێک بەرەو سەرکردایەتی بەڕێ کەوتین و لەسەرکردایەتی چەند شـــەوێک ماینەوە بەڕێز مام جەلال فەرمانـــی پێکردین کە لەگەڵ ســـەلاح چاوشـــین بچینە خوارەوە و کە ئەوکات پێدەچوو کاک ســـەلاح چاوشـــین کاری خێری بەدەســـتەوە بێ، ئیتر لـــە هاوینی ١٩٨١ هاتینە خوارەوە بۆ ناوچەی دۆڵێ و دۆڵەڕوت گوندی کانی گۆران. بیست و سێ پیشـــمەرگەیەک ئەبووین. کاتێکمان زانی خەڵکی گوندەکە لەناو خۆیاندا بوو بە شـــەڕیان، بەدارو بەرد کەوتنە یەکتری. خەلیفەی براشـــم کەوتە ناوبژیوانی کردنیان بۆ ئەوەی کێشـــەی دڵ تەزێنی لێ دروســـت نەبێت، بەردێکیان هەڵداو بەر ســـەری خەلیفەی برام کەوت، ســـەریان شکاندو خوێنێکی زۆری لێ دەهات. پێشـــمەرگەکان ویســـتیان لێپرســـینەوەیان لەگەڵـــدا بکەن. کاکە خەلیفەم نەی هێشـــت هیچ شـــتێک بەرامبەریان بکرێت. خەڵکەکە زیاتر لە بیســـت و پێنج کەســـێک ئەبـــوون. زۆریان پێناخۆش بوو بێتاقەتی خۆیان پیشـــان دا کە ســـەری شکابوو. خەڵکی ئاواییەکـــە زۆر دڵگـــران بوون. کاکە خەلیفە گووتی من بەو شـــەڕتە لە خوێنـــی خۆم خۆش ئەبم کـــە هەمووتان باوەش بکەن بەیەکدا ئاشـــت ببنەوە یەکتری ماچ بکەن. ئینجا من لێتان خۆش ئەبم. ئەوانیش کەوتنە یەکتری ماچ کردن و ئاشـــت بوونەوە. ئەوەی شـــایەنی باســـە ئەم سێ خێڵە بوو شەڕکەرەکان: خێڵی ئەحمەدی محەمەد عەبدوڵا، خێڵی حاجی ســـاڵح، خێڵی قالەی شێخ عەبدوڵا. ئەوەی شایەنی باسە کاکە خەلیفەم لەناو خەڵکەکەدا زۆر خۆشەویســـت بـــوو. کاکە خەلیفەم ناردمیەوە بۆ ســـەرچنار چالاکیەک هەبوو ئەبووایە بمکردایـــە پێی وتم. منیش چووم بۆ ئیشـــەکە کۆمەڵێک بەرپرســـی بەعس بوون لەپیاوانی ئەمن لەماڵێک قوماریان ئەکرد، ئێمەش بچووینایەتە سەریان بۆ چالاکیەک، دەلیلێکمان هەبوو تەنزیم بوون لەوێ بوو لەسەرچنار، ئەوەبوو بەڕێ کەوتین بۆ ئەوێ لـــە کاکم جیابوومەوە. ئەمانـــەم لەگەڵدابوو کەمالی برای مجید گورگە و ئەحمەد کوێرەو خەبات مەلا عەبدول و ســـەلام و عومەر حاجی عەبدول کەریم کارێزکلاو عومەرچاوشین چووینەوە بۆ سەرچنار لەچەند ماڵێکەوە

که دراوسێیان بوون بەســـەر دیوارەکەدا سەرکەوتین تاکو چووینە سەر ســـەربانەکەی ئەوان من و عومەرچاوشین و وەستا کەمال بوو، ئەحەمەد کوێر و دووپێشـــمەرگەیەکی تر ناوەکانیانم لەبیر نەماوە لەبینایەکی نوێ دا دروست کراو لەوبەر جادەکە بەتاریکی. ئەوان لەوێ بوون ئەگەر ئێمە تووشـــی تەقەبووین ئەوان ئێمە وەرئەگرنەوە تەقەمان لەســـەرئەکەن تا ئەگەینە لایان ئێمەش لەســـەر سەربانەکانی ماڵەکان زۆربەهێواشی بچین بۆ ســـەریان دیاربوو ئەوان پێش ئەوەی کەبچینە ســـەریان لەوە ئەچوو ئاگاداربن لەماڵەکەی دراوسییان بەحسابی کەسی تیا نەبوو کارەباشیان دانەگیرساندبوو لەقادرمەکان ئەو ڕیزە ماڵە هەمووی لەیەک ئەچن چومە خوارەوە و لەهەموو لایەکەوە دەســـت کرا بەتەقەلێ کردنم هەر ئەوەندەم پێ کرا لەســـەر قادرمەکانەوە تەقەم لێ کردن و ئیتر لەهەموو لایەکەوە بوو بەتەقەو دەســـت ڕێژی زۆر ئێمەش کەمن و عومەر چاوشین و وەستا کەمال برای مجید گورگە بووین بەحساب بچین بیان گرین یان بیان کوژین تاکوخۆمان ڕزگارکرد لەسەربانەکەو یەکسەرخۆمان هەڵدایە خوارەوە بەڵام بەســـوکی برینداربووین، ئەو پێشـــمەرگانەی خۆمان نەبووایا کە لەوبەر وەریـــان گرتینەوە لە جادەکە نەمان ئەتوانـــی بپەڕینەوە ئیتر کاتێکمان زانی ســـەعات٤ ی بەیانییە چووین لەقلیاســـان پاسێکی پۆلۆنی دیاربوو شۆفێرەکەی تازەلەماڵ هاتبووە دەرێ و ئەیویست بچێ بۆ کارکردن لەوێ لەگـــەڵ خۆماندا بردمان بۆلای هەناران تـــۆزێ نزیکی کردینەوە تازەش خەریک بوو دنیا ڕووناک بێتەوەو لەگەڵ کاکەخەلیفەم یەکمان گرتەوە منی نارد بۆ خەســـتەخانەی سەردەشت لەگەڵ حەمە ڕەشید و عومەر حاجی عەبدول کەریم چووین بۆ سەردەشت بۆ خەستەخانە و دوای تیمارکردنی برینەکەم و ماوەیەک سوپاس بۆ خوای گەورە چاک بووینەوە.

لـــەوێ بەڕەحمەت بێ بـــرای گەورەم کاکە عومـــەرم هات بۆ لام بۆ سەردەشـــت دیاربوو کاکە خلیفەم ناردبووی بۆ سەردەشت چەند ڕۆژێک پێکەوە بووین دوای ماوەیەک گەڕامەوە بۆ ســـەرکردایەتی نووســـراوێکی کاک ئەوشیروانم برد کاکە خەلیفەم چووە بۆ شاربازێر من لەسەرکردایەتی

مامـــەوە، من چاوەڕوان بووم کە ســێ تفەنگمان بدەنــێ بۆ کەرتەکە لەچاوەڕوانی دابووم زســتانێکی ســاڵی ١٩٨٢ بوو لەساردســاردتربوو کوێســتان و گەرمیانی کوردستان شــەختەبەند بوون و جووڵان بزووتن لە شــاخەکاندا قەســتی ســەربوون، ئێمەی پێشــمەرگە ئەگەر چی ﭺ ئەزموونی چەندین ســاڵی ژیانی زســتانمان لەچاو هەردی کوردســتاندا هەبوو. من ئەو زســتانە مولازم عومەر نووسراوی دامێ بۆ سێ تفەنگ بــۆ عەبدوڵڵای حەمــە ئەمین ئاغای بارێ لە بلەکــێ بوو بۆم بکرێ و بمداتێ و خۆشــم تفەنگێم پێ بوو دواتر عەبدوڵــلا ئاغا تفەنگەکانی بۆ کڕیــم و دایمێ وتی بەڕای من ســەفەر مەکە تابەفرەکە خۆش ئەکاتەوە وتم نابێ دەبێ بڕۆم بەچیاکەدا هەڵگەڕام ئەوشەوانە پلەی سەرما ڕەنگە پانزە پلە لەژێر سفرەوە بێ، من دەبوو بپەڕیمەوە بۆ زێ و بەفر لەسەر ڕووخەکانی باڵازەلامێک کەوتبوو چیا وەک شوشەلوس بووبوو دەبوو زۆر بەشــارەزاییەوە پێیەکانم بگوێزم بەرەوڕووی بنارە شاخەکە ببمەوە خۆم بەدارەکەدا دەکێشــم و پەرچەکرداری پێکدانەکە بەدەوری دارەکەدا دەم ســـووڕێنێت و لەنگەر دەگرم ئازارێک لەهەناومدا دەمکوژێ و سەرم گێژ دەخوات چاوم ڕێشکەو پێشــکەدەبێ ووردەوردە خەریکم ورە بەردەدەم و خۆم تەســـلیمی دڵ ڕەقی بەفر دەکەم قەدەرێک بەو حاڵە دەمێنمەوە پاش پشـــووم وەبەردێتەوە ئاوڕێک لەو دۆڵ و چیایە دەدەمەوە هێشـــتا تەم و مژە نازانم ناوقەدیم بەجێ هێشتووە مل ملانێ لەگەڵ بەفرو مەرگ دادەکەم و خۆشەویســـتی ژیان دەم بزوێنێ لەدڵما تارمایی مردن و ڕەق بوونـــەوە کاڵ دەبێتەوە جار ناجارێک تاکو نێوقەدم لەبەفردا نوقم دەبوو هەندێک تەقەشــم دەکرد کەس بەدەنگمەوە نایـــەت چوونکە دێهاتەکان ڕاگوێـــزراون و چۆڵـــن بەهەرحاڵێک بـــوو بەچوار تفەنگەوە گەیشـــتمە گونـــدی زێ لەوێ لەماڵی مەحمود ناوێک بووم کـــە دوو خێزانی هەبوو کەمیواندارێکی جوانی منی کرد، لەوێشـــدا دایە پیرە بەســـەلیقەی خۆی تیماری دەست و قاچی سەرمابردووی بۆ کردم نانیان دامێ لەپەسا پەسا چای گەرمیان دەرخـــوارد دەدام دواتر لەپێخەفی پاک وگەرمدا جیگایان

بۆ داخستم بۆ خەوتن سێ چوار ڕۆژێ مامەوە تاکو پێیەکانم تۆزێ چاک بێتەوە، بەیانییەکی خۆم ئامادەکرد بۆ ڕۆیشـــتن مام ڕەسوول وتی کوڕم مەڕۆ بابەفرەکە تۆزێ هێورتر بێتەوە وتم مامەگیان دەبێ برۆم نابێ لەمە زیاتر تاخیر تربم، دەبێ بچمەوە لای برادەران چوونکە ئێستا چاوەڕوانمن بادڵیان شـــتێک نەکات ئیتر بەدوو ڕۆژێکی تر گەیشتمەوە دێی چنگیان بەڕێکەوت جەماعەتمان لەوێ بوون لەپێشـــەوە عەریف بەکرو ســـالاری سەلمە وەستا کەمال و هیوای مەلا عەبوول و برادەرانی تر. ئەوان چوون هەواڵیـــان برد بۆ کاکەخەلیفەم و هات بـــۆ لام و بەخێرهاتنەوەی کردم وتـــی مادەم ئەتزانی ئاوا بەفرێکـــی زۆرە نەهاتیتایەوە، وتم بەخوا لەبەر تۆ هاتمەوە ئیتر دەنگوباســـی سەرکردایەتی لێ پرسیم وتی دیارە لەوێ تاخیر بووی، وتم بەڵێ وایە مولازم عومەر ویستی لەوێ چەکەکانم بداتێ و ئەمەش حاڵ ومەسەلەکە بوو، ئیتر هاتمەوە بۆ شارباژێر لەگەڵ کاکە خەلیفەم یەکمان گرتەوە هەندێ جەولەمان کردو ئێمەشماینەوە لەدێی گورگەیەر پێشـــمەرگەیەکمان لابوو خوشکەزای شەهید حسین بوو ناوی دلاوەر بوو کە شـــەوەکەی لە ســـلێمانی شـــەهید حسین حاجی غریب و عومەرشـــێخ ڕەحیم بووین لە ناو شـــار حەسەن حاجی غریب و مەحمود حاجـــی غریبمـــان دی ڕۆژەکەی لەگەڕەکی هەوارە بـــەرزە لە ماڵی کاک ئەحمەد بەرامبەر ماڵی شـــێخ ڕەحیم ئەوانمان دی و دووسەعاتێک لامان مانەوە هەندێ قســـەمان کرد دەربارەی ئەو ئیشـــەو ئیتر ئەوان ڕۆیشتن ئەو دووسێ شەو لەناو شار تووشی ئەو کارەساتانە بووین حسێن حاجی غەریب شـــەهید بوو ئێمەش گەڕاینەوە ڕۆژەکەی کە لە شـــارباژێر بووین دلاوەرو بوورهانی خوشـــکەزای شەهید حسین هاتنە دەرەوە نەیان زانیی بوو کە هەر شەوێ حسێنی خاڵیان شەهید بووە، ئیتر کاکم زۆرموراعاتی شعوریانی کردو وەکو خوشکەزای خۆمان هەڵسوکەوتمان لەگەڵدا ئەکردو دڵخۆشـــی دانەوەی دلاوەریان وتی من هەرنەبـــێ بمێنمەوە هاتووم ببم بەپێشـــمەرگە هەرچەند کاکەخلیفەم زۆرهەوڵی ئەدا کەبینێرێتەوە بەڵام نەڕۆیشتەوە کاکم زۆر ڕێزی لێ گرت لەبەر ئەوەی خوشکەزای ئەو هاورێ

خۆشەویســـتەمان بوو کەخۆی گەیاندە شەهید حوسێنی حاجی غەریبی خوالێخۆش بوو ،زۆر جار لەگەڵ پێشـــمەرگەکاندا کێشـــەی تووش ئەبوو بۆمان چارەســـەر ئەکرد و ئەمانویســـت بچێ بۆ ئێران بۆ ئەوەی نەوەک لەشەڕێکدا لەگەڵمان شەهید بێ  کە هەموو پێشمەرگەکان لە بەرخاتری ئەو زۆر ڕێزیان لێ ئەگرت.

دوای ماوەیـــەک دلاوەر لەگەڵ پێشـــمەرگەکاندا دەمە بۆڵەی هەبوو هەندێ غەڵەتی کردبوو بە پێشمەرگەکان کاکە خەلیفەش پێی وت خۆت چاک ئەزانی هیچ شوێنێک نییە لەهێزی پێشمەرگەدا بەقەدەر ئێمە ڕێزت لـــێ بگرن ئێمە هەمووومان بەخوشـــکەزای خۆمانت ئەزانین بۆ وا ئەکەی ئەویـــش وتی من ئەمەوێ بم گوازنەوە بـــۆ ناوچەیەکی تر وابزانم بۆ لای مەحمـــودی حاجی فەرەج. کاکە خلیفەش  وتـــی زۆربیرت لێ کردۆتەوە وتی بەڵی یەک دوو ڕۆژی تریشـــی دایە ئەو هەر لەســـەر داواکەی خۆی ســـوور بـــوو. کاکە خەلیفەش نامەی نەقڵی بۆ کـــردو  وتی بچۆ بۆ لای بەکری حاجی ســـەفەر با نامەی هەرێمت بۆ بکات و شتێ پارەشی دایە بـــۆ ڕێگا وتی باپێت بێ ئەو ڕۆیشـــت و خواحافیزیمـــان لێ کردو ئیتر حەفتا پێشـــمەرگەیەک ئەبووین هێزەکە لەگورگەیـــەر دامەزراین بۆ نان خواردن و لە ماڵەکان سەعات دەوری دووسێ پاش نیوەڕۆ ئەبوو لەسەر ســـەربانەکان و لەبەردەمـــی مزگەوتەکاندا بووین هەموو ڕاوەســـتابووین کاتێکمـــان زانـــی دلاوەر پەیدا بـــووەوە  دەمانچەیەکی پێیـــەو دیاربوو ســـیروانی حەمە فرج پێی وتـــوە مەچۆ بۆ ناوچـــەی هەڵەبجەو نامەی نەقڵەکە بدڕێنەو ئێمە ئەتکەین بەپێشـــمەرگە لای خوالێخۆش بوو عومەر ڕەشـــید، کاکە خەلیفەم پێ وت دلاوەر فەتاح ئەی تۆ قەرار نەبوو بەڕێ بکـــەوی خواحافیزبوونمان لێ کردی ئـــەم دەمانچەیە چییە، دلاوەر وتی من مەمنونی کەس نیم نامەی نەقڵم بۆبکات لەهەرچی شـــوێنێک بێ من ئەتوانم پێشـــمەرگەبم کاکم پێی وت ئێ باشە کوڕی باش بۆ کوێت ئەوێ وەرەقەت بۆ ئەکەین دلاوەر وتی دووبارەی کردەوە وتی من مەمنونی کەس نابم کاک ســـیروان وتویەتی پێویســـت بە وەرەقە نییە، کاکە خەلیفەش

زلەیەکی لــێ داو وتی لەم ناوە نەت بینمەوە ئیتر، کاکە خەلیفەم خۆی وتــی ئەڕۆین بۆ بزەنگیان وردە وردە پێشــمەرگەکان بنێرە. منیش دوو دوو پێشــمەرگەکانم ڕەوانەکرد، دووسێ پێشــمەرگەیەک مابوون ئەوەی شــایەنی باســە کاکە خەلیفەم لە ماڵەکانی ئەوبەر گورگەیەر بوو زیاتر چل تاکو پەنجا پێشمەرگە لەبەردەمی مزگەوتەکەدا بوو. عومەر ڕەشیدو ســیروانی حەمە فەرەج و دلاوەر هاتــن، وتیان کوا ئەو کوڕی.....! وتم غەڵەت مەکەن. ئیتر دووبارەیان کردەوە جارێکی تر. وتم غەڵەت مەکەن بــۆم قبووڵ ناکرێت!!! ئیتر عومەر و ســیروان و ئــەوان تفەنگەکانیان بەدەســتەوە بوو، بوو بە میل ڕاکێشــان و جنێــودان و تەقە لە هەموو لایەکەوە دروست بوو.

بــە منیان وت چەکەکەو فــڕێ بدە و میل هاتــەوە و ئیتر ئێمەش هەموولایەکمان ئاگرمان بە شانەوەیە ئەوە بوو تەقە لەبەینماندا دروست بــوو لە ئەنجامــی تەقەکە پێشــمەرگەیەکی زۆری لێ بــوو لەبەردەمی مزگەوتە کە عومەر ڕەشید و دلاوەر فەتاح گیانیان لەدەست دا و سیروانی حەمەفەرەجیش ڕای کرد، بەڵام لە ڕاکردنەکەیدا فیشــەکێکی بەر کەوت تفەنگەکەی فڕێ داو ڕۆیشت بەرەو چەمەکە منیش بەرەو گەڕەدێ بەڕێ کەوتم. ئەوەی شایەنی باسە عومەر ڕەشید ماوەی دوو مانگ بوو هاتبووە ڕیزی پێشــمەرگەی یەکێتی نیشــتمانی فەرماندەی مەفرەزە بوو شارەزا نەبوو لە یاســای شۆڕشــی تازە. کــە ئەویش بریتی بوو لــەوەی کە گواستنەوەی پێشــمەرگە ئەبێت بە فەرمانی لەسەر و خۆی بێت. نابێت بێ پرس و پسوولەی گواستنەوە پێشمەرگە وەربگرێ.

کــە ئەو وەزعە ڕووی دا لەو کات وســات و وەختەدا خۆم تەســلیم نەکرد، چوونکە دادگای یەکێتی قەرەقوش بوو لەو سەردەمەدا، یەکسەر بە کاتژمێرێک دادگا کردن و گولەباران کردنت یەکێک بوو. چوونکە خۆم یەکێتیم ئەناســی. لەبەر ئەوە بەچاکم زانی کە پەلە نەکەم با وەزعەکە ئەهوەن بێتەوە. ئینجا خۆم تەسلیم ئەکەم بۆ ئەوەی دادگایەکی عادیلانەم بــۆ دابنرێ، بەڵام بە پێچەوانەوە بــوو ئەوان چەند مەفرەزەیەک هەر بە

شـــوێنم دا ئەگەڕان، منیش وتم با تووشـــی پێکدادانی تر نەبمەوە بێتە هۆی زەرەرو زیانی زیاتر.

دوای ئـــەوەی کـــە زیاتر لە پانـــزە ڕۆژێک لە شـــاربازێر مامەوە لەو دێهاتانە ئیتر بە ناچاری تەسلیم بەڕژێم بوومەوە، خۆم کرد بە ڕەبایەکەی ســـامانەدا بە ڕۆژ تاکو چەند دەقەیەک دەوری ســـەعات هەشتی بەیانی ئەبوو کە چووم بۆ ڕەبایەکە. ئیتر بردیانم بۆ مقەڕی فەوج دوای یەک دوو شەو بەرەو سلێمانی بەڕێیان کردم، لەوێ ئیفادەیان لێ وەرگرتم و منیش وتم ئەمەوێ ببم بەهاوولاتیەکی ساڵح لە دوای ئیفادەکەم وتیان بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە بەڵام ئەمزانی شتێک لەمێشکیانە هەبوو چوونکە دەموچاویان وادیار بوو بەڵام بەهەرحاڵ شـــتەو ڕووی داوە تازە بووەو دوای دووســـێ ڕۆژ هەوڵم دا خوالێخۆش بوو جەمال تاهیر بدۆزمەوە ئەوە بوو لای وەستا مەدحەتی کەبابچی کانێســـکان خوالێخۆش بوو جەمال تاهیرم دی و زۆر بە چاکی بۆم گێڕایەوە داوام لێکرد هەرچی فەرمانێک شۆڕش بڵێ من لە ناو شار ئەیکەم بەس بەمەرجێک غەیری کوردبێ ئەو بەڕاستی زۆردڵگران بـــوو بـــەو وەزعەو بەس هەندێ ئامـــۆژگاری کـــردم و زۆردڵی ڕاگرتم و وتی زۆرکەس تووشـــی شـــتی وابوون و تەنیا چارەکە سەعاتێک کەمتر پێکەوەبوویـــن. ڕەحمەتی جەمال تاهیر زۆر دڵســـۆزی پێوە دیاربوو، بەتایبەتـــی کەمال تاهیری بـــرای وەکو برای گەورەم وابوو. بەڕاســـتی ئەمزانی کەبەرپرســـە، بەڵام نەمئەزانی کە بەرپرسی هەموو شارە، بۆیە پێم وت بۆ جوابەکەی لەبەرامبـــەر طروق لەوچاخانەیە چاوەڕوانت ئەبم، دوای دوو ڕۆژی تر بەس هەوڵ بدەی نامەبنووســـی بۆ سەرکردایەتی کە جوانەمەرگ تەجمید نەکەن و چەکیشـــی نەکەن من ئامادەم دە بۆ پانزە ناوێکـــم بۆ بێنە لەناو شـــار کە کورد نەبن و عـــەرەب وپیاوی ڕژێم بن بۆتان جێبەجێ ئەکەم ئەوکاتە بڕیام دابوو لەو پانزە ناوەی کە ئەو بۆم ئەهێنێ کامەیانم بۆ ئاســـان بێت بۆیـــان ئەکوژم بەو مەرجەی ئەوان کە گەڕامـــەوە بۆ دەرەوە دادگایەکی زۆر بەویژدانانەم بۆ دابنێن. خوالێخۆش بـــوو جەمال تاهیر پێی وتم لای فندق کانی و فندق ســـەلام لە جادەی

ســالم ئەگەر بەرپرسێکی گەورەی ڕژێمت دەست کەوت، ئەوا فەرمانە من پێت ئەڵێم جێ بەجێی بکە. ئەوکاتە من لە پێش تۆدا لە ســەرکردایەتی ئەبم و کارەکەت بۆ ئاســان ئەکەم، بەڵام دەســت و بردی زۆر تێدا بکە. ئەوەبوو چەند شــەوێک لە فندق کانی مامەوە لای ئەحمەد چاوشــین و زرار کۆیــی. ئەوە بوو لە گەڕەکی ئەقاری ئەگــەڕام بیرم ئەکردەوە کە ئیشــەکەم کرد چۆن هەوڵ بدەم دەرباز بم لەم شوێنە زۆر مەترسیدارە، بەڵام بێســوود بوو چوونکە دەرچوونم مەحاڵە. لەبەر ئەوە چالاکیەکەم بــۆ نەکرا. دوای چەند ڕۆژێک پێم وت، من ئەزانم کە لە ســەدا ســەد ســەرکەوتوو نابم بۆ دەرچوون. لەم لاشــەوە کاکە لەتیفم نووسراوێکی نووســی بۆ نەوشیروان مستەفا داوامان لێکرد کە چ چالاکیەکی ئەوێ لە ناوشاردا بۆی ئەکەین بەمەرجێ دادگایەکی بەویژدانانەمان بۆ دانێن، تازە شــتەو ڕووی داوە دیارە کەس پێی خۆش نەبووە کەشــتی وا ڕوویدات، بەڵام لە ئەنجامی ناهۆشــیاری وهیلاکی و ماندوو بوون ئەو کارەســاتە ڕووی داوە، دوابڕیاریش لای تۆیە. کاکە لەتیفم چووبوو بۆ شــارباژێر بۆ گوندی چنگیان بۆ لای کاکە خەلیفەم و چاوی کەوتبوو بە وەهاب. وەهاب پەیمانی شــەرەف و ســوێندی خواردبوو بۆ کاکە لەتیفم کە بەهەموو توانایــەوە لەگەڵ کاکە خەلیفــەم دا بێت. ئەوەی کە کاکە خەلیفەم کە قەت بیری لێ نەئەکردەوە پشت لێ کردنی نەوشیروان مستەفا بوو لەو، چونکە زۆر جار کە باســی ئەوی ئەکرد، دڵنیا بوو کە ئەو زۆری خۆش ئەوێ. لەبەر چەند هۆیەکی زۆر تایبەت بە خۆیان. دوای هاتنەوەی کاکە لەتیفم لە شــارباژێر لــە گوندی چنگیان بە خوالێخــۆش بووی دایکمدا نامەکەمان نارد بۆ دەرەوە لەوێ نەوشــیروان مســتەفا و مولازم عومەر وەڵامــی نامەکەیان بە دایکمــدا ناردەوە. دایکم لەماڵی ســالار عەزیز مابووە لە ناوزەنگ، نووسیبووی من دیارە هەرئەوە لە ئێوەی شۆڕشگێڕ چــاوەڕوان ئەکەم من خۆم لەکاتێکی نزیکدا وەڵامتان ئەدەمەوە با کەریم لەشــاردابێت، ئینجا دایکم نامەکەی هێنایــەوە من دوای یەک دوو ڕۆژ چووم بۆلای خوالێخۆش بوو جەمــال تاهیر، ئاگاداری وەڵام و نامەکەی

ئەوشیروان مستەفام کرد ئەویش پێی باش بوو ، پێی ڕاگەیاندم کە لەناو شـــاردا بە هیچ شـــێوەیەک هیچ ڕوونادات من دڵنیام لەسەر قسەی تۆ، وەکو ڕەحمەتی خۆی زۆر باوەڕم پێی هەبوو ئا لەم کات و ســـاتەدا ڕژێم لە ژێر چاودێری خۆی و پیاوەکانی دابووم کە بە هەمیشـــەی بە دوامەوە بوون کە زۆر بە ئاسانی هەستم پێیان کردبوو،هەندێ جار واخۆم نیشان ئەدا کەبێ ئاگام لێیان.و هەر بە دوامدا ئەهاتن کە ئەیانزانی من بۆهیچ جێگایەک ناچم تاقەتیان ئەچوو لە چاودێری کردنم ئەگەر بشـــم زانیایە ئەچم بۆ جێگایەک و ئەوان نەزانن بەتەکســـی ئەچووم و خێرا ئەهاتمەوە ، لەم هاتووچۆیەدا ئەوەبوو دوای چەند ڕۆژێک هەواڵمان بۆ هاتە کە کاکە خەلیفەیان شـــەهید کردوە. کاکە لەتیفم هـــات ئاگاداری کردم و هەندێ نموونەی پێشمەرگایەتی بۆ هێنامەوە کە مرۆڤ لە ژیندا ڕۆژ تەواو بوون بەدەســـت خوایە، نازانێت کەی ڕۆژی تەواو دەبێت دوای ماوەیەک پێی ڕاگەیاندم کە کاکە خەلیفەیان شـــەهید کردوە. ئەمە زۆر کارەســـاتێکی گەورە بـــوو بۆ بنەماڵەکەمـــان. دوای ماوەیەک ڕەحمەتـــی دایکم زۆر دڵنەوایـــی دامەوە بەڵام بیرکردنـــەوەم و هەروەها دڵنیابوون لەوەی ئەو خوایـــەی کە هانی داوین بۆ هەڵســـتان بەم جـــۆرە قوربانی دانە، هێزو توانای ئەوەشمان پێ ئەبەخشێت کە بەرگەی بگرین.

زانیـــم کـــە زۆر پەلە کراوە لە کارەکەو دەســـتێکی بەعســـی تیا بووە. ئەندامێکی پایەبەرزی یەکێتی پێوەندی بەڕژێمەوە هەبوو. بەمەرگی کاکە خەلیفەم چەند شاگەشکەو کامەران بووە جار ئاجارێک لە شەرماندا سوور هەڵئەگەڕا چونکە هەڵوێســـتی نامەردانەی هەبـــووە کە هەتا بینەقاقای شـــەرمەزارو ریســـوایی بووە. بەم جۆرە پاکانەیە بـــۆ خۆی ئەکات کە دەســـەڵاتم نەبووە یاخود پاکانەی بۆ خەڵکی ناوچەکە ئەکرد . وەکو لە دواییدا ئاشکرا بوو ئامانجی ســـەرەکی هەبووە چوونکو پێشمەرگەیەکی چالاک و نەبەردییان لەکۆڵ بەعس کردەوە، کە بەعس بەئاواتی ئەخواست. ئەوانەی کەبیروباوەڕی پێشمەرگایەتیان شێواندوە بۆ مەرام و مەبەست و بەرژەوەنـــدی خودی خۆیان، ئەوانەی گەل و میلەتەکەیان و حیزبەکەیان

کردۆتـــە ئامراز بـــۆ بەدیهێنانی بەرژەوەندی تایبەتـــی خۆیان. تەنانەت مەرگ و گیان لەدەســـت دانی هەرچ قارەمانێک ، کەنە بەپێی یاســـاو بەبڕیارێکی ســـەرپێی بوو. چـــۆن ئەبێت حیزبێکی پێشـــکەوتووخوازی شۆڕشگێر بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ کارەساتێکی ئاوادا بکات یان دەبوو دادگا یان لێژنەیەکی تەحقیق و یاســـا ناس و دادپەروەر بەشـــێوەیەکی عاقڵانی بڕیاریان بدایە نەک بەو شێوەیە و کە لە بنەمادا لە عەشایەریش خراپترە کە ئەم لایەنە دوا ڕۆژی دەســـەڵات و کلتوری عەشـــایەری پەلە پەل و بڕیاری گولە باران کردنی بۆ پێشـــمەرگە یان چۆن ئەم بەرپرسە بـــۆی هەبووە ئاوا حاکمی موتڵەق بێت، کە فەرماندەی کەرتێک بێ هیچ تەحقیقێک شـــەهیدی بکەن یان بەســـەدەها کوڕی کـــوردی گولە باران نەکـــرد. ئەوە بـــوو دوای ٢٠٠٣ دەرکەوت نەک هـــەر خائین بووە بەڵکو مەلەفەکەی لە مەلەفی ســـەدەها مەفرەزە خاســـەو پیاوی حکومەت باڵا بەرزتـــرە چالاکیەکانی دە هێندەی مەفـــرەزە تایبەتەکان چالاک تر بووە چوونکو لەژێر پەردەی شۆڕشـــدا حەقیقەتیشی زانیوە دوای ئەم هەموو کارەساتە پیاوی ڕژێمش بووە. بەڵام دیارە لای ئێمە زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە ئەو مەبەســـتی سەرەکی شەخسی لە شـــەهید کردنەکەدا چی بووە. کە لە سەرکردایەتیەوە بۆ ئەم کارە بەتایبەت هاتونەتە خوارەوە ڕوون و ئاشـــکرایە کە ناوچەی شـــاربازێڕ هیـــچ پەیوەندی بەویشـــەوە نەبووە، بەشـــەرتێک فەرماندەی هەرێمی ســـێ بەکری حاجی سەفەر بوو. بۆیە لەســـەرکردایەتیەوە زۆر بەپەلە بووە لەو کارە بۆ ئەوەی ئێمە لە شۆڕش دوورخاتـــەوە بۆ بەعس وەک ئامـــاژەم پێدا. ئێمە لـــە وتووێژدا بووین لەگەڵ ســـەرکردایەتی و بەتایبەت کاک نەوشـــیروان. ئەم بۆ ئەوەی من نەگەڕێمەوە بۆ ناو شـــۆڕش و ئەو کارەی کەپێم ڕاســـپێرابوو نەیکەم، توشی چەندەها کێشـــە بووم تەنانەت لەناو بەعسیش. هەرهەمان کەس نامـــەی ناردبوو بۆ ڕژێم و ئاگاداری کردبوونـــەوە کە گوایە من دەمەوێ چالاکی بۆ پێشـــمەرگە بکەم لە ناو شـــاردا بۆیە ڕژێم زۆر لەسەرخۆو بە چڕی چاودێرییان دەکردم.

دوای چەند ڕۆژێک خوالێخۆش بوو جەمال تاهیرم دی، خۆشـــی زانی بووی کە کاکە خەلیفەیان شـــەهید کردوە. سوێندی بۆ خواردم بە گۆڕی شـــەهید ئارام، کە بۆ کاکە خەلیفە بەقەد منالێکی خۆی پێی ناخۆش بووە. خۆشـــی وتی ئەچم بۆ لای کاکە لەتیـــف. من بە خوالێخۆش بوو جەمال تاهیریشـــم وت ڕژێم بەهەمیشەیی بە دوامەوەن، تاکو ئەوکاتەش نەمئەزانی ئەوکەسە کێیە کە دەنگ و باسی شۆڕش دەگوازێتەوە بۆ ڕژێم دوای ســـاڵی ٢٠٠٣ ئاشـــکرابوو هەر هەمان ئەندامی پایەبەرزی یەکێتی فایلـــی ڕژێمی کەشـــف بووەو لە ڕۆژنامەی هاوولاتـــی دا چەندین نامەی بڵاو کرایـــەوە. هەموو هەوڵی ئەوەبوو کە ئێمە وەکو بنەماڵە لە کورد و شـــۆڕش دووربخاتەوە و بە سەدەها خەڵکی شۆڕشگێڕی لە شۆڕش دوور خستوەتەوە.

هەرخوای گەورەش بووکە هیدایەتی دامێ بۆ خۆڕاگریم بەوکارەســـاتە یـــەک لە دوایەکانە، منیش بیرم لـــەوە دەکردەوە هەرچیم بۆ بکرێ ئەی کەم بۆئەوەی ئەوانیش وەکو من ئازار بچێژن ئەوەبوو دیسان خوالێخۆش بوو جەمال تاهیرم دی زۆر زۆر ناڕەحەتی خۆی پیشان دا پێی ڕاگەیاندم کـــە قـــەت لەگەڵ کەمالی برامـــدا جیاوازیم نەکـــردوی و قەتیش کەس چاوەڕوانی ئەوەمان لە شـــۆڕش نەکردوە هەتا سەرکردایەتی بروسکەشی نـــاردوەو بە ئێزگەش ئەو هەواڵەیان ڕاگەیانـــدوە کە ئەو کارە نەکەن و نەوشیروان مستەفا نووســـراویی نووسیوە چوونکە شەخسی نەوشیروان مســـتەفا زۆر بێ تاقەتە بەرامبەر هەموو کارەســـاتەکان کە ڕوویان دا، منیش پێم وت من دڵنیام کە دەســـتێک هەیە لە دەرەوە کە ئەم ئیشەی پێ کردوون بۆ ئەوەی من لێرە هەرچی خراپەیەک هەیە بەرامبەر شۆڕش بیکەم کە ئەو ئاســـودە دەکات و بـــە ڕژێمی ڕابگەیەنێت کە لە ئەنجامی کارەکانی ئەو من بوومەتە پیاوی ڕژێم وەک چالاکی بۆ خۆی بنووســـرێ لای ئاغاکانی بەغدا.

لەگـــەڵ خوالێخۆش بوو جەمال تاهیر زۆر قســـەمان کرد و وتی ئێوە ژیانتان لەســـەر کورد و شۆڕش بڕاوەتەوە نابێ کاری ناشایستەو ناشرین

لەئێـــوەوە بووەشـــێتەوە چوونکە خەبات و نیشـــتیمان پەروەی خۆت و بنەماڵەکەتان دیارە لای هەموو کورد کە لە ڕۆژانی تەنگانەدا پێشمەرگەو چەک بەشانی بوون ئیتر لە دوای ئەم گفتوگۆیەمان یەکتریمان جێ هێشت ،ئەوەبوو کاکە لەتیفم نووســـراوێکی نووسی بۆ نەوشیروان مستەفا داوای لێ کردبوو کە بە زۆر کەریم بەرەوکاری هەڵدێری مەبەن، با لێرەوە بەس بـــێ و بە دایکی ڕەحمەتیما نامەکەمان ناردەوە بۆ ســـەرکردایەتی ئەوە بوو نەوشـــیروان مستەفا و مولازم عومەر وەڵامی نامەکەیان دابووە وەکو پرسەنامەکەی نامەیەکیان نوسیبوو هەتا نەوشیروان مستەفا وتبووی من لە خەلیفە ئەچم وابزانە من ئەوم بە دایکمی وتبوو دایکیشـــم پێی وتبوو فەرقی نییە کوڕم دیارە خوای گەورە هەر ئەوەندە بە ئێمەی دابوو، ئیتر وەڵامی نامەکەی کاک نەوشیروان بە دایکمدا نووسیبووی بۆ کاکە لەتیفم ئەڵێ بەڕاســـتی کە ئەم نامەیە ئەنووســـم نازانم چۆن باســـی بنەماڵەی ئێوە بکەم بە ڕاستی هەر ئەوەم لە ئێوەی شۆڕشگێڕ چاوەڕوان ئەکرد و هەندێ شتی تریش .....

چەند ماڵێک بەپەنجەی دەســـت ئەژمێردران لەشـــاری سلێمانی کە هاندەرێک بوون بۆ دروست کردنەوەی شۆڕش بەڵام تازە ئەو ڕووداوە کە ڕووی داوە بەڕاســـتی هەموومانی دڵگران کردوە. هەرچەندە بروسکەشم کرد بەڵام تازە خوا ســـەبووری ئێوەو ئێمەش بداتـــەوە. ئیتر لەماڵەوە کەوتمە بیرکردنەوە، لە مەســـەلەیەکی کوردی دا ئەیگێڕنەوە ئەڵێن شێخ هۆمەر بەلای شەخەڵێکی چڕو پڕدا ڕا ئەبوورێ. شەخەڵەکە ئاگری گرت بوو دوکەڵی لێ بەرز ئەبووەوە. شێخ هۆمەر ئەڕوانێ ئاگر زۆری بۆ مارێک هێنـــاوە کە لە ناو توترکێکدا داگیری خـــواردوە خەریکە لەگەڵ پوش و پاوانی شـــەخەڵەکەدا بســـووتێ. مار لە تاو ئاگرو دوکەڵ ئەفیشکێنی و هەڵئەبەزێتەوە بەڵام هیچ ڕێگایەکی نابی دەرباز بێ. شێخ هۆمەر بەزەیی بە مارەکەدا دێتەوە گالۆکێکی درێژی پێ ئەبێ بەســـەر ئاگرەکەدا بۆی ڕایـــەڵ ئەکا. مارەکە خـــۆی لە گالوکەکەوە ئەپیچـــێ و لە ئاگرەکە تێ ئەپەڕێ، بەڵام هەر کە ئەگاتە شـــێخ هۆمەر خـــۆی لە ملی ئەئاڵێنێ و

ئەیەوێ پاداشتی چاکەی شێخ هۆمەر بەگەستنی بداتەوە.

ئایا پاداشـــتی خەڵکێک ئاوا ئەدرێتەوە فەرماندەی کەرتی شەشـــی هەرێمی ســـێ بەبێ هیچ لێکۆڵینەوە و دادگای کردنێک شەهیدی بکەن. ئەوەبوو لە لە ٢٠٠٣ زیاتر بۆمان ڕوون بووەوە کە سیخوڕێک لە بەرەکانی پێشمەرگەدایەو ئەندامی سەرکردایەتیە و دەستی ئەوی تیابووە چوونکە فایلەکەی ئاشـــکرابوو. لە ناو شاریش دا بەبۆنەی هەمان کەس هەزارانی بە زۆر ئەکرد بە پیـــاوی ڕژێم، وەڵام ئەهاتەوە گوایە کاک فلان خەڵکی ناردۆتەوە بۆ کوشـــتنت ئاگات لەخۆت بێت. من ئەم زانی کە ئەو نیازی چییە لەبەرچی هەوڵی ئەوە ئەدات بەڵام من شۆڕشی کوردم لەو پیلانانەی ئـــەو زۆر بە گەورەتر ئەزانی کە ڕام کێشـــێ بـــەرەو خیانەت. بۆ مێژوو ئەیڵێـــم کە بەهەزاران کەس هەیە کە زۆربەشـــیان کوژراون بە زۆر وایان کـــردوە کەببێ بە جاش و خۆفـــرۆش، بۆیە ڕژێم و هەندێ لەو فایلدارانە ئیشـــەکەیان ئەوە بووکە خەڵکی دڵســـۆز بە زۆر بکەن بە مستەشـــارو مەفرەزە خاصە و دژی شۆڕشی کورد. ئەوانە بەو خزمەتە ئاغاکانیان دڵ خۆش ئەکەن، بگرە بەخشیشی زۆریش لەلایەن ڕژێمەوە وەرئەگرن. جێی خۆیەتی نووسەران و ڕۆشـــنبیران بەهەند ئەم ڕووداوانە وەربگرن و لێی بکۆڵنەوە ولەسەری بنووسن .

* کاکە خەلیفەم تەمەنی ٢٨ ساڵ بوو کە شەهید بوو. لە ساڵی ١٩٧٣ تا ١٩٧٥ پێشـــمەرگە بوو لە دوای نەکســـەی شۆڕشی ئەیلوولەوە دوور خرایەوە بۆ کەربەلا لەناوەڕاستی ١٩٧٦ بوو بە مەفرەزەی سەرەتایی شۆڕش.

خوالێخۆش بوو عەبدوڵڵا محەمەد ئەمین پیاوێکی زۆر خۆشەویســـت بوو لەناوخەڵکدا ڕیش سپی بنەماڵەکەیان بوو لەناوخەڵکدا کاسبێکی ڕاستگۆ بوو، ئەم پیاوە دۆستایەتیەکی زۆرمان لەگەڵیدا هەبوو، کوڕە گەورەکەی کەناوی عومەر عەبدوڵڵای مینە حەلێیە لەگەڵ کاکە لەتیفم پێشـــمەرگە بوون لەشۆڕشـــی نوێشـــدا عەلی کوڕی و برازاکەی پێکەوە پێشـــمەرگە بووین ، لەپێک هێنانی ئەم دۆستایەتیە و زیاتر نزیک بوونەوەو تێکەڵاوی و دۆســـتایەتی زیاتری نێوانمان بنەماڵەکەمان بەباشـــیان زانی کە داوای کچەکەیـــان بکەن بۆمن، ئەم پیاوە خۆشەویســـتە ڕازی بوو بەخزمایەتی کردنمـــان، لەوڕۆژەوە تائێســـتا لەگـــەڵ گەلاوێژی کچی کە هاوســـەری منـــە ژیانێکی خۆشـــمان گوزەراندووە کە ئێســـتا ئەندامانی ئەم خێزانە لەچەندکەسێک پێک دێت.

خوالێخـــۆش بوو عەبدوڵـــڵای مینە حەلێ کەئەکاتـــە خەزوورم لە ٩ مانگی ٨ ســـاڵی ١٩٧٦ دەســـت گیر ئەکرێ لەگەڵ بەکری حاجی عەلی و کەریم نەریمانی مەقاول کە ئەو ســـەردەمە کاری ڕێکخســـتن بۆ قیادە موەقەتەی ئەو کاتە ئەکەن، لە ڕێگەی نامەو نامە گۆڕینەوە نامەیان لای شـــەهیدی ســـەرکردە ئیدریس بارزانییەوە بۆ دێ بۆ خۆ ڕێکخستنەوەو خەبات کردن لە شۆڕشی گوڵاندا. بەڵام نامەکان لەلایەن پیاوانی ڕژێمەوە گیرا و دواتر ئەمانیش دەســـتگیرئەکرێن و لەدادگای ســـەورە بە بیست ســـاڵ زیندانی کران. لە ١٠ مانگی ٨ ســـاڵی ١٩٧٩ بەلێبووردنی گشتی بەربوون و دیســـان خەزوورم لەســـاڵی ١٩٨٥جارێکی تر گیرایەوە بەڵام براو برازا و کوڕەکانی بەردەســـت نەکەوتن پێوەندیان کرد بە لەشـــکری شۆڕشـــگێڕی کورستانەوە بوون بە پێشمەرگە، کە بە سەرپەرشتی کاک ئەحمەدی برای و عومەرو کەمال و ڕێبوار و بەختیاری کوڕی کە ژمارەیان ٢٥ پێشـــمەرگە ئەبـــوون. خوالێخۆش بوو عەبدوڵـــڵا محەمەد ئەمین بە بیســـت ســـاڵ بەندکردنی تری بۆ بڕایەوە لە دادگای خاسە، ناردیان بۆ زیندانی ئەبوو غرەیب لەوێشـــەوە دوای ماوەیەک بۆ موســـڵ، لە کۆتایی ســـاڵی ١٩٨٨ دیســـان لێبووردنێکی گشـــتی تر درا، بەڵام مەخابن ئەم

جارەیان یاساکە ئەمی نەئەگرتەوە لەبەر ئەوەی یاسای لێبووردنی گشتی عێراقی یەک جار دەیتوانی ئازاد بکات دواتر نا. خوالێخۆش بوو عەبدوڵلا محەمەد ئەمین جاری پێشـــوو ڕزگاری ببوو، دیارە ئەم جارەیان یاساکە ئەوی نەئەگرتەوە بۆیە هەموومان هەوڵمان بۆ دا بەڕێگایەکی ئاســـان و بەپـــارە کاری بۆ بکەن بۆ ئازادکردنی کـــە بڕی ٧٠٠ دیناری ئەوکاتەی دا ، ئەویـــش بەڕێگای ئـــەوەی کە داوای پەنجە مۆریـــان کردبوو بزانن چەند جار گیراوە و بەربووە، هەستاین لەڕێگای بەڕێوەبەری زیندانییەکان پەنجەمۆری یەکێکی تریان کرد بەڵام ناوەکەی هی ئەم بوو، پاش ماوەی چەنـــد مانگێک وەڵام هاتەوە لە بەغـــداد وتیان عەبدوڵلا محەمەد ئەمین ئازاد بکەن بەر لێبووردنی گشـــتی کەوتووە. بەعس دیار بوو پلانی بۆ ئەوە دارشـــتبوو کە براو کوڕەکانی و برازاکانی پێشمەرگەن، لەبەر ئەوە دەرمانێکـــی کوشـــندەیان دابووێ کە لە ماوەیەکـــی کورتدا بە ئازارێکی زۆرەوە بەهەمان نەخۆشـــی گیانی لەدەست دا. شایانی باسە لەو کاتەدا ناوبراو چوارکوڕ و براکەی و برازاکانی کە کۆیان ئەکردە بیســـت و پێنج پێشمەرگە لە نێو ڕیزەکانی لەشکری شۆڕشگێری کوردستان دا بوون.

مـــن وام بەباش زانـــی لەو بارودۆخە نا ئارام وپڕ لـــە خەمەدا لە دوای ناو هاتنەوەم بچم بۆ خزمەتی ســـەربازی و لەتەجنیدی ســـلێمانی خۆم ناونـــووس بکەم کە لەو ماوەیەدا لێبووردنی گشـــتیش هەبووبۆ ئەوانەی کە ســـەربازی هەڵهاتوون یاخود هەرنەچوون بە شەرتێ دەبێ لە ماوەی یەک مانگدا پێوەندی بکەی ئەوانیشـــی لە دەرەوەن ٤٥ شـــەو مۆڵەتیان هەبوو کە خۆیان ناونووس بکەن و لێبووردن ئەیانگرێتەوە ، منیش وەک هەموو ئەو چەند هەزار کەسانەی کەخۆیان ناونووس کرد بەرەوسەربازی ملی ڕێگام نا ولەوێشـــەوە ڕەوانەی سەربازگەی تانجەرۆیان کردم کەئامر فەوجەکەمان ڕائید جەمال حەمەســـووربوو کەنامەی خوالێخۆش بووکاک جەمالـــی فاتەم بۆ برد کە جێگای سوپاســـە بۆ ئەوهاوکاری و دەســـت گیرۆیـــەم و ئەویش یارمەتی دام لە هاتـــوو چۆکردنم لە دوای مانەوەی یەک مانگ لەوێ ڕائید فەریق ئەحەمەد کەریم هات بۆ ســـەربازگەکەمان بۆ ئەوەی بزانن کێ فارســـی ئەزانێ لەگەڵ خۆیان بیبەن بۆ بەرەکانی جەنـــگ و بۆ کاری بۆ وەرگێرانی خۆیان ودیلەکانی ئێران ، من بەباشـــم زانی ناوی خۆم ناونووس کرد ودوای حەوت ڕۆژ گوازرامەوەبۆ سەنگەری دواوەی بەرگـــری کردن ودوای چەندرۆژێـــک چەنددیلێکی ئێرانیان هێنا منیـــان بەرەوڕووکردنەوەبۆ وەرگێرانی وتەکانیـــان ئەوانەی ئەوان ئەیان وت من هیچی لێ تێ نەئەگەیشتم بەتایبەتی بەکارهێنانی وشەی چەنگی کۆمەلێشتی ســـەربازی لەوێدازانیم کاری وەرگێران هەرواناسانییە ئەوەی مـــن دەم زانی بەئەزموونی خۆم و ژیانی پێشـــمەرگایەتی و دەربەدەری شارەوشـــاری ئێران فێربووبووم توانیم لەهەندێ وشـــەوگفتوگۆی سادە ئەو ماوەیـــە هاوکاریان بکەم لەبری ئەوەش ڕائیـــد داراو مولازم حەمید وڕائیدفریق کەکورد بوون زۆر ڕێزیان لێ ئەگرتم

لەپاڵ ئەرکی سەربازی و هاتووچۆ کردنم ،دواتر هەڵسام بە نووسراوێک بـــۆ وەرگرتنی وەکالەتی برنج بەکۆمەڵ فرۆشـــن لەڕێگای عاشـــەوە کە زۆر سوپاســـی هونەرمەند مســـتەفا ئەحمەد کە ناســـرەوە بە (خولە چەخماخـــە) لە باری ئابووری و کۆمەڵایەتی منی ئەزانی، بۆیە بەوپەڕی دڵســـۆزیەوە زۆربەی زۆری کارەکانی بۆ ئەنجام دام بۆ بەدەست خستنم بەو وەکالەتە. لە دوای دەســـت بەکاربوونم بـــە ماوەیەک برنجم بۆ هات لە کەرکوکەوە ئەبووایە بچوومایە بۆ بەڕێوەبەرایەتی عاشـــە و لەوێ ٢٥ وەکیلی موفرەدیان بەرەورووم بکردایەتەوە و بارەکانم بەســـەردا دابەش بکردنایـــە. بەم شـــێوەیە کاروانی ژیانم بەڕێ دەکرد لەگەڵ ســـەربازی و بوونـــی ئەم وەکاڵەتە تا وای لێ هات لە بازاڕەکەشـــدا شـــارەزایەکی باش پەیدا بکەم بە هاوکاری و ڕێنمایی چەند دۆســـت وخزمێکی نزیکی خۆم و بۆ ڕای کردنی ئەرکی ســـەربازیەکم و چاوپۆشـــیان لەنەچوونم و کەمی ســـەردانم بۆ سەربازگا منیش بەپارە هاوکاریم دەکردن و ئەوانیش مەعنەوی ئاگایان لێم ئەبوو بەم شـــێوەیە کاروباری خۆمم ڕیکخستبوو، چەند دۆســـتێکی باشیشم هەبوو لە ناوشـــاردا کە بارودۆخی مادیان زۆر بـــاش بوو قاچاغ چی بـــوون و لەئیش و کاری خۆیان بـــەردەوام بن و هەر کاتێکیش باری فســـتق و بادەم و قەیسی و شتی وشکەیان بگیرایە لەبازگەکان من هاوکاریم ئەکردن بۆ ئازاد کردنی. لەو کاسبانەی ناو بازاڕ ئـــەم بەڕێزانە بوون کە پێوەندی زۆرچاکمان هەبوو کاک ڕەحمان گومرگ حاجی عوســـمان عەلی شیوەکەڵی حاجی سەعید حاجی محێدین و چەند کەســـێکی تر ئەمانە مانگانە پارەیەکی باشـــیان ئەدا بە بەرتیل بۆ کار ئاسانیان و بەرێوەچوونی کارەکەیان. بەڵام لە پێناوی ئەو پارەی وەریان ئەگرت چاوپۆشیان لەمنیش ئەکرد و کاسبکارەکانیش مانگانە شەش بۆ حەوت لۆریان پڕ لە وشکە ئەکرد و بەرەو بەغدادیان بەڕێ ئەکرد.

دوای ماوەیەکی تر لە بازاڕەکە کۆمەڵە خەڵکیکی کاسبی ترم ئەناسی

لەو بەڕێزانە کە ئێســـتا بە سوپاسەوە ناویان ئەهێنم عوسمانی مەلا قادر و ئەحمەدی برای کە یارمەتی باشـــیان ئەدام لە ئیش و کاســـپی برنج و ئاردو شـــتی تر جار نا جارێک بۆ شـــت کڕین ئەوان هاوکارییان ئەکردم. لەگەڵ حەسەن ڕەش دڕی و ئەحمەد قامیشی دۆستایەتیەکی زۆر چاکمان هەبوو. حەسەن ڕەش و ئەحمەد قامیشی لەکوێتەوە ئاڵتونیان بۆ ئەهات کە ئاڵتونیش لەو ســـەردەمەدا یاساخ بوو لەبەر باوەڕ بەیەک بوونمان بە یەکتر برای یەک بووین و زۆربەی شەو پێکەوە بووین و سیقەی تەواویمان بە یەکتر هەبوو.

خوالێخۆش بوو نەجمەدین حاجی ڕەشـــید زۆر دۆست و خۆشەویستم بوو ، خوالێخۆش بوو مەحمودی شازەمان لەگەڵ کەمال کوردی بەرپرسی کاســـب کارانـــی یەکێتی بـــوون هەردووکیان گیرابـــوون ،چووم بۆلای خوالێخۆش بوو نەجمەدین حاجی ڕەشـــید و حاڵ و مەسەلەکەم تێگەیاند کە هاوکارمان بێت. ئەویش دیاری و پیکابە کلینیکسی ئەدانێ بۆ خۆیان، ئەوانیـــش ئەگەر تۆمەد بارێکی سیاســـی بەند بووایە لێ کۆڵینەوەکەیان بۆ ئاسان ئەکرد، زۆر جاریش بەریان ئەدا.ئەمیش لە بەرامبەردا یارمەتی مادی ئەدانێ لە گیرفانی خۆی. خوالێخۆش بوو نەجمەدین حاجی ڕەشید بۆ بەردانی خوالێخۆش بوو مەحمودی شـــازەمان زۆر بەهەڵوێســـت بوو ،وتی گرفت نییە، ڕائید تەهاو مولازم ســـوهام بـــە مۆڵەت ئەڕۆنەوە بۆ جنوب داوای سەیارەکەیان لێ کردووم کە سەیارەیەکی مارسیدسی ڕەش بوو کە لەو ســـەردەمەدا زۆر زۆر کەم بوو، ئیتر پشـــتی پیکابێ دیاری کلینیکســـی بۆ ئەپێچانەوە و ناردی لەگەڵیاندا ئەوانیش کاک مەحمود و کاک کەمالیـــان بەردا بێجگە لەوەش ئەوەندە قارەمان و چاو نەترس بوو زیاتر لە بیست ژن لە کارگەکەی کاریان ئەکرد کە دایک و خوشک و ژنی پێشـــمەرگە بوون کە زۆربەیان ئەناسم ئێستاش کە لەو کاتەدا لەترسی ڕژێم خۆیان شاردبۆوە.

بڕوام بەیەکێتی نەمابوو لەهەمان کاتیشدا خۆم بە دوژمنیشیان نەئەزانی چوونکە چەندین ساڵ بە دەیەها هەڤاڵم لەناوئەواندا شەهیدبوون بەهۆی چەوتـــی بەناو ســـەرکردایەتی چوار دەور دراوبە هێلی نهێنی ســـیخوڕی دوژمـــن و بێ ئاگایی ئەوان لەو ڕووداوانـــەی کەهۆکارەکانی فایلدارەکان بـــوو، لە دوای ئەو هەموو نەهامەتیەی بەســـەرماندا هات وەکو خۆم و بنەماڵەکەمان لەکۆســـت کەوتن و پشـــت گوێ خستنی خەرمانی خەبات و ماندووبوون و دڵســـۆزیمان بۆ شۆڕشی کورد ئاکامەکەی بەو ڕۆژگارانە تەواوبێت کە لەدەســـەڵاتی هیچ کەســـێکدا نەبێ بـــۆ گەڕانەوەی مێژوو ڕوونەدانی ئەو کارەســـاتانە لەگەڵ هەموو ئەم ناخۆشـــیانەدا هەمووکات و ســـات دڵ و دەروونم خوێنمی جۆش ئەدا بۆ یارمەتیدانی شـــۆڕش لە ســـەنگەرێکی ترەوە و لە بێ باوەڕی هەندێک کەســـی نـــاو یەکێتی کە بـــۆ بەرژەوەندی خۆیان لەناویاندا بوون، لەگەڵ ئەوەشـــدا ڕێگربوون لە دڵســـۆزانی کورد. لەناو یەکێتیدا هەندێک هەڤاڵی خۆشەویستم هەبوون کە زۆربەیان لێپرســـراوی سەربازی بوون، ئەوانیش زۆر دڵگران بوون بە شـــەهید کردنی خەڵکانێکی بێ تاوان ڕوویان ئەداو دواتر چارەسەرکردنی مەحاڵ بوو من بەهەمیشـــەیی لەو بیرکردنەوەنەدا بووم و دەمویســـت لە شـــۆڕش دوورنەکەومەوە و پێوەندیم هەبێت بەشۆڕشـــەوە خزمەتکاری میللەتەکەی خۆم بم.

پێش ڕاپەڕینی بەهاری ســـاڵی ١٩٩١ زۆر جار بیرم ئەکردەوە ئەبێت ئێمەی کورد لەبەر دەمی دووڕیاندا یان دەبێت سەرشۆڕ بکەین بۆ بەعس وەک و نۆکەر لەبەردەم بەعســـیان دا ؛بە پشتا یان بەدەمدا بکەوی یان لەگەڵ هێزێکی تری خەبات سەر بۆ هیچ زاڵمێک دانەنوێنێ لەم بڕیارەدا. من لەمەیە دوژمنانی کورد ئەکەم بەدوو بەشـــەوە، مەســـەلەی سەگ و تووتکەکەیە. دەگێڕنەوە کابرایەک ســـەگ و تووتکەکەی دەباتە بازاڕ بۆ فرۆشـــتن، کڕیار نرخیان دەپرســـێ، کابرا دەڵێ ســـەگەکە بە ٥ دینارو

دینار و تووتکەکە بە ٢٥ دینار کابرای کڕیار دا ئەمێنی و لێی ئەپرسێ کابرا چۆن ئەو سەگە گەورەیە بە ٥ دینار ئەو تووتکە زڕنەقووتە بە ٢٥ دینار. کابرا دەڵێ برا ئەمەیان سەگەو ئەویان سەگ کوڕی سەگە. ئەوجا بەڕاستی لەم بوارەداو هەموو بوارەکانی دی بەعس سەگ کوڕی سەگە. زۆر جار خۆم لە خۆمم ئەپرسی بەعس چی بەسەر هێناوین ١٥٠ تا ٢٠٠ هەزار کوردی فەیلی دەربەدەر کران و بەناوی نا عێراق و ئێراقی نەبوونەوە دەرپاڕاندن و دەستیان بەسەر هەموو موڵک و ماڵ و سامانیاندا گرتوون و زیاتر لە ٢٥٠ هەزار دیکەیان ئاوارەو پەرش و بڵاو پێکردەوە. تەنها خۆیان ئەزانن چەندیشیان کوشتووە. ئەوەنە بەسە بڵێین ٨ هەزار مێر بارزانیان لە تەمەنی ١٢ ساڵاندا و تاکو ٨٠ ساڵی کەس نازانێ چییان بەسەر هاتووە.

یەکەمجار لەڕێ‌ کاک جەمال حەســەن بوو کە برای کەمال حەســەن چاومار بوو،ئەوکاتە کەمال حەسەن لە چاڵە خەزێنە بوو. هەڤاڵانی پارتی زۆر لە جەماعەتی لیژنەی ئیغتیالاتی یەکێتی سڵیان ئەکردەوە. ئەوانەی ڕێکخستنی پارتی بوون لە شارا وەکو حەسەنی شیرین و حاجی محەمەد ســەنگاوی جەزای کارەبا لەگەڵ چەند کەسێکی تر کە لەگەڵیانا قسەم کرد. زۆر باوەڕمان بەیەک هەبوو کە هەڵســام بەئاگادار کردنی شەهید کەمال ئەندازیار و گۆران، بە هاوکاری نەوزاد حســێن بازیانییەوە وەستا مجید و ئەمناســین و ئەمزانی کە ئەمانە بەرپرســی لیژنەی ئیغتیالاتی یەکێتین لەگەڵیاندا چەند جارێک ڕاستەوخۆ گفتوگۆمان کرد. لای فولکەی مروری کۆن لە گەڕەکی عەقاری وتم کوشتنی خەڵکی پارتی کارێکی باش نییە ئەوانیش لەوانەیە بکەونە دەست کردنەوە لە خەڵکی یەکێتی کە بەم کارە هەردوولاتان ڕژێم ئاسوودە ئەکەن و کوردیش زەرەرمەند دەبێ دیار بوو ئەوانیش ئەم کارەیان پێ خۆش نەبوو بە تایبەتی شــەهید کەمالی ئەندازیار کە ڕای زۆرباش بوو، ئەو تەنیا لەناوشــاردا زیاتر ئیشی لەسەر پیاوانی ڕژێم ئەکرد کە عەرەبن و هەڵسوکەتی باش لەگەڵ میللەتەکەماندا ناکەن، لە ناوشاردا من زۆر بەکوڕێکی باشم ئەزانی باوەڕیشم پێی هەبوو ڕۆژێکیان لێی قەوما لەگەڵ کاک نەوزاد حســین بازیانی و وەستا مجید، کاک کەمالمان بە پیکابەکەی نەوزاد بەبازگاکەی ئەزمەڕدا برد بۆ ئەودیوو، من پێوەندی زۆر چاکم هەبوو لەگەڵ پارتی هەتا لە کاتی کارەساتەکەی ڕەحمەتی شــەهید عەبدوڵلائاغا ئامادەبووم لەگــەڵ خزمانی ڕەحمەتی بکوژەکــەی بکوژینەوە ،بەڵام دیاربوو مەفرەزەیەک لە دەرەوە هاتبوو بۆ ناو شار ئەو چالاکیەیان ئەنجام دا، بابە ڕەسول و سێ چوار پێشمەرگەی تر بوون ئەو چالاکیەیان کرد زۆر دڵخۆشــیان کردین بەوچالاکیە، چونکە بە ڕاســتی شــەهید فەتاح ئاغا پیاوەتی و دۆستایەتی هەبوو لەگەڵماندا بەتایبەتیش شــەهید عەبدوڵلائاغاش، هەروەها کەمال حەســەن چاومار

ئاگاداربـــوو کە پێوەندی زۆرچاکمان هەبوو ئاگام لێ بوو زۆر لە نزیکەوە ڕۆژێکیان بەڕەحمەت بێ کامەرانی ئەحەی شـــازەمان هاوڕێ و خزمیشم بـــوو پێی وتم مولازم کەریم زۆر ســـەلامت لێ ئەکات ئەڵێ هەرچ کاتێک کەریم هەرئیشـــێکی هەبێ بە چـــاوان بۆی ئەکەم، منیش دوای ماوەیەک زۆر باوەڕم بە خوالێخۆش بوو کاک حەمەغریب کاکە ڕەش هەبوو لەگەڵ کاک مژدە تاهیر پێم وتن لە ناوشـــار وەکو پاســـۆک ئەتوانم ئەوەی کە داواکەن بۆتان بکەم، من وخوالێخۆش بوو برایمی حاجی کەریم بوو ئەوە بوو شـــەهید مولازم کەریم و وخوالێخۆش بوو برایم حاجی کەریم لەکاتی ڕاپەڕینەکەدا پاسۆک کردیان بە بەرپرسی سەربازی پاسۆک.



چەند ڕۆژێک پێش ڕاپەڕین سەرۆک بارزانی چەند نامەیەکی نووسیبوو بۆ بەشـــداری کـــردن لەڕاپەڕین، بە مـــەلا فائیق بازیـــان دا ناردبووی، لەنامەکەدا وانووســـرابوو کـــە ئەبێ دەوری کاریگەرمـــان هەبێ. نامەکە دەست خوالێخۆشـــبوو سالّحە ڕەش کەوتبوو، منیش لەگەڵ خزمەکانمدا لەماڵـــی خۆمان کۆبوونەوەیەکمان کرد بەسەرپەرشـــتی خوالێخۆش بوو غەفور مەنمی و ســـالّح ڕەش و کاک عومەری حەمە مراد و کاک ڕەزای حاجی مستەفای لەنجاوە و کاک بەکری غەفور مەنمی.ئەوەی ڕاستی بێ ســـێ کوڕی بەکری غەفور مەنمی، بـــەرزان و بوورهان و دیلمان زیندانی بوون. ڕژێم لەئەمنەسورەکە کۆبوونەوە ئێمەش وابەچاکمان زانی یەکەم جار پەلاماری ئەمنەکە بدەین. لە کۆبوونەوەکەماندا خۆمان ئامادەکرد بۆ دەست بەسەراگرتنی ئەمنەکە.

ئیتر لەگەڵ جەماوەری ڕاپەڕیوی شاردا دامان بەسەر ئەمنە سورەکەدا و زیندانەکانمـــان ئازاد کـــرد. هەرچی لە بەڵگەنامەو دەســـکەوت هەیە هەموویمان تەسلیمی حاجی بەکری دێ کۆن مان کرد و ئەویش تەسلیمی بە کاک کەمال حەســـەن چاومار کردبوو. دواتر بڵێسەی ڕاپەڕین هەموو کوردستانی گرتەوە.

هەڵســـاین بـــە هێزێکـــی زیاتر لە دوســـەدوپەنجا کـــەس ئەبوو کە خوالێخۆشـــبووان غەفور مەنمی و ســـاڵح ڕەش و عەلی شەمە و عومەر حمە مراد، لەگەڵ حمە زاهیر حاجی عەبدوڵقادر لە تاســـلوجەو گەڕەکی ڕاپەڕین و ئێمەش بارەگاکەمان لەگەڕەکی دووڕنەمن بوو کە دووخانوومان کردبـــوو بەبارەگای خۆمان دوابەدوای ئەمـــان چووین کاک قادرقادرمان لەماڵی ســـلێمان ئاغا بوو و لەگەڕەکی شـــەهیدان و لەوێ دیمان لەگەڵ خوالێخۆشبووان غەفوور مەنمی و عومەر حەمەمراد هەندێ ڕێنمایی کردین ئینجا فازیل ڕەئووفم دی ئەویش ناوی بنکەکانی داینێ و وەرەقەمەکانی لـــەوێ لەگەڵ خوالێخۆش بوو غەفور مەنمی بنکەی ســـی وشـــەش مان دروست کرد کەزیاتر لە سەد کەسێکی لێ بوو. دوای ئەوە پارتی لەڕێگای فازیـــل ڕەئووفەوە داوای هێـــزی کردبوو بۆ کەرکووک ئێمە بە جیا من و خوالێخـــۆش بوو غەفوور مەنمی و بەکری غەفـــور مەنمی چووین بەرەو کەرکوک. خوالێخۆشـــبووان ســـاڵحە ڕەش و عەلی شەمە و ئەوانیش لە قۆڵێکـــی ترەوە فازیـــل ڕەئووف ناردنی بۆلای کەمال حەســـەن. کەمال حەسەن بەرپرسی ئەو هێزانە بوو کە دەنێرانە کەرکوک.

ئیتـــر لەهەموولایەکەوە پەلاماری کەرکوک دراو، ســـوپاس بۆ خوای گـــەورە ئازادکرا بێ زیان بووین. بەڵام ئـــەوەی جێگای نیگەرانیمان بوو لـــەوەی کەهێـــزەکان ئەزموونی مانـــەوەو خۆقایم کردنیـــان نەبوو بۆیە لەســـەربازگەی خالید زیاتر تێک شـــکاین ونەمان توانی بچینە پێشەوە لەبەر ئـــە وهێزەگەورەی دوژمـــن کەلەوێدا گەمارۆدرابـــوون و نەبوونی ئەزمـــوون بۆ ئەو هەموو هێزەی کە هەبـــوو لەگەنج و ڕۆڵەکانی کورد و پەرت وبڵاوی و ڕێکخستنێکی پتەوی نەبوو لەو بڕوایەدام ئەم هۆشیاریەی کەئێستا هەمانە لەڕووی مەشق وڕاهێنان، ئەمان توانی نیوەی عێراقیش ئـــازاد بکەین. بەداخەوە دوای چەند هەفتەیەک هێزەکان شـــکان بەرەو قەرەهەنجیر و چەمچەماڵ و ســـلێمانی ڕۆیشـــتنەوە. لەسلێمانی ماینەوە بەدڵ گرانییەوە دەڵێم کە لەقەرەهەنجیر شەهید ڕەزای حاجی مستەفای لەنجاوە لەگەڵ چوار ئامۆزای شـــەهیدبوون لەکەرکوک لەگەڵ ئەو هەموو بەرگـــری کردنە بێ ســـوود بوو خەڵکەکە ڕەو لەناوچەوانی نووســـرابوو لـــەدوای هاتنی کوردەکانی کەرکووک و چەمچەماڵ وســـنورەکانی هاتنە

سلێمانی ئەوەبوو شار چۆڵ کرا.
سـالّی ١٩٩١ لـە ڕەوەکەدا هەموو کورد کۆچ بـار بوو ڕوویان کردە چیاکانی کوردسـتان. ئێمەش بە دەیەها خێزانەوە بەرەو چیاکان بەڕێ کەوتین. لە پشـکنینەکەی گۆغلان لەوێ مام جـەلال و مولازم عومەرو سـێ کەسـی تر هاتن. دوو لانکرۆزەریان پێبوو. دیار بـوو لەئێرانەوە گەڕابوونەوە. مولازم عومەر ڕووی تێکرم و وتی کەریم کوا پێشمەرگەکانت، وتـم ئەوەتان بـۆ کاک عومەر بۆچیتە؟ وتی بەڵکـو لەگەڵماندا بێن بۆ پێنجوین، چوونکە مفەوەزاتە مام جەلال ئەچێت بۆ بەغداد ناکرێ نەڕۆین لەم وەزعە ناخۆشەدا. ئیتر منیش بانگی خەسرەوی برام و هێرشی برازام و ئاری خوشـکەزام لەگەڵ مام جەلال دا بوون. دلێری خوشکەزام و دوو پێشمەرگەی تریش چوونە ناو کەوچکی شۆفلەکەی زراری سایەقەوە، بۆ ئەوەی ڕێگاکە لە مەترسی پاک بکەنەوە. چوونکە و لەو کاتەدا جەماعەتی چەکـداری زۆری لێ بوو. مام جەلال نەیئەتوانـی بە تەنیا بڕوات. هەتا جەماعەتی تەحسین شاوەیس چەندین خێمەیان هەڵدابوو لەسەر ڕێگەکە. ئەوەبوو توانیمان بیان گەیەنین بۆ پێنجووین بە سەلامەتی.
هەموو کورد ڕەوی کرد بەرەو چیاکان و گوندە کاول کراوەکان، لەدوای ڕەوی بێ شـوماری خەڵکی کورد جارێکی تر هێزەکانمان ڕێکخسـتەوە چووین بەرەو چوارتا لەوێ بارەگایەکمان لەسـنووری لقی چواری پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزراند. قادرقادر و شەهید عوسمان قادرمنەوەر وشەهید مەحمود ئاغا بەباشیان زانی ئێمە بەهێزێکەوە بچین بۆ سۆتکەو سـورگا و قولەڕای سـێ. لەوێ بارەگامان دانا ئاگاداریان کردین هەرچ کاتێـک بەئیزگـە ئاگاداریان کردین ئێمە یەکسـەر ڕێگای سـلێمانی و چەمچەماڵ بگرین نەیەڵین ئەو سەربازانەی کەهاتبوونە ناو شاری سلێمانی بگەڕێنەوە. ئیتر لەو کاتەوە ڕاپەڕینی دووەم دروسـت بوو. ئێمەش هەر وەکـو لقی چـوار فەرمانمان پێ کرابوو هاتین بەرەو سـەرچنار لەگەڵ جەیشەکەی ئەوێ بوو بە شـەڕ، لەئەنجامدا توانیمان دەست بەسەریان بکەین و چەکیان بکەین. بەڵام لەوێ چەند پێشـمەرگەیەکی یەکێتی بە هاوەن بریندار ببوون. یەکێک لە بریندارەکان عەزیزی برای شـەهید مەلا خالید بوو، کە سەرتیپ بوو لەگەڵ کەمال ناوێک کە ئەویش بریندار بوو

بە فیشـــەک. دوای ماوەیەک مامۆســـتا فائیق و لیژنەی تەنسیق داوایان کردین کەبچینەوە ناو شار وەکو ئاسایش و ئاگامان لەشوینە گشتیەکان بێ نەهێڵین لەوەزیاتر تالان بکرێ. بۆ پاراســـتنی ئاسایشـــی شـــارەکە هەڵساین بەهاوکاری لیژنەی تەنسیق .....

بـــارەگای پارێزگا نزیکەی ٢٥ پێشـــمەرگە ئەبووو٢٥ پێشـــمەرگەش بەفەرمانگەی عاشـــەو ٣٠ پێشـــمەرگەش بۆ خەســـتەخانەی شیرەکە و ١٥ پێشـــمەرگەش بۆ ئەلبیسەکە. ئێمەش بارەگای گەورەمان لەگەڕەکی ئاشتی بوو، کە بە بەردەوامی ٣٠ پێشمەرگەی لێ بوو.

ئیتر لقی چوار تەشـــکیلاتی دروســـت کرد بۆ ئەو هێزانە خوالێخۆش بوو غەفور مەنمی بەتالیۆنی نۆ و خوالێخۆش بوو سالح ڕەش فەرماندەی بەتالیونی دە و من فەرماندەی بەتالیۆنی سی و سێ. لقی چوار بەچاکیان زانی من بکەن بە هێزێکی ڕێگر لەو جەردەو چاوچنۆکانە. لەگەڵ هاوکارانم لە لیژنەی بەرەی کوردستانی ڕێگە بگرم لەوکەسانەی کەشوفڵ و گەلابە و ســـەیارەی خۆڵ بەرەو ئێران ئەبەن. منیش بەهێزێکەوە ڕێگاکانم لەو چاوچنۆکانەو نەفس نزمانە گرت و تەسلیم بە لقی ٤و بەرەی کوردستانی و هێزی هاوبەشم کردن بەڵام جەردەو چاوچنۆکەکان ئەیانویست زۆر زوو دەوڵەمەندبـــن بۆیە هێزی چاوچنۆکان ئێجگار زۆر بوو لێپرســـراو هەبوو زیاتر لە٢٠ شـــۆفڵ و گەلابەی دەرئەکرد لەهێزی کەسدا نەبوو کەڕێگربێ بەڕێز کاک نەوشیروان ئەوکاتە خۆی زۆربەی بازگەکانی گۆڕی هەرچاری نەکرد ئێمەچەندین جار تووشـــی تەقەو بەرامبەرین بووینەتەوە لەگەڵیان کەچارەســـەر نەبوو تـــا دوای هەڵبژاردن و دروســـت بوونی حکومەت و پەرلەمـــان، ئیتر پارتی هێزی ســـەربازی لەشـــارەکاندا کـــەم کردەوە ئەیویســـت دیاردەی چەکداری لەنێو شـــارەکاندا هەیە کەمیان بکاتەوە هەرچی هێزو بەتالیۆنەکان هەیە ئاگادری کردن کەهەندێکی کەمی چوونە سوپاکانەوە ئەوانی تریش چەکە قورســـەکانیان تەسلیم بەسوپاکرد کە ئەوکاتە دەروێش ئاغا بەرپرســـی ســـوپای شاری ســـلێمانی بوو ئەوەی ڕاســـتی بـــێ زۆر لە کادرە ســـەربازیەکانمان لێ زویر بـــوو من ئەوکاتە دووهاوەن و دۆشـــکەیەکم تەسلیم بە ئەنوەری حاجی عوسمان وحەمەی عەزەبانی کرد زۆربەی کادرە ســـەربازیەکان بەهەمان شێوە چەکەکانیان

تەسلیم بەسـوپاکرد بەڵام برادەرانی یەکێتی هەستان بەدروست کردنی لیـوای یەک کەفەرماندەی لیواکە ئاواتی شـێخ جەناب بوو، ئیتر هێزی نابەرامبەر دروست بوو، لە نێوشاردا منیش بەفەرمانی مەکتەبی سەرۆک کرام بەکارگێڕی مەکتەبی ڕێکخستنی سلێمانی. لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٤ و یەکێتی مەسـئولینیان بە کۆمەڵ ئەچوون بۆ ئەو ماڵانەی کە پارتین، مەسـئولینیان کرابوون بە چەند بەشـێکەوە بۆ میوانداریان و خۆ نزیک کردنـەوە لێیـان. داوایان لێ ئەکردن یان ببن بە یەکێتی یان کە شـەڕ دروست بووەوە بەشداری نەکەن لەشەڕی پارتی و یەکێتی، زۆر بەئاشکرا ئەم داوانەیان لێ ئەکردن هەموو ئەو کەسـانەی کە میوانداریان کردبوون ئەهاتن بۆ لقی ٤ و ڕێکخسـتنی تایبەت ئاگاداری میوانەکانیان ئەکردین کە چ داوایەکیان لـێ ئەکەن. دوای ئەوەی کە هەرچی فەرماندەی هێزە کۆنەکان و فەرماندەی بەتالیۆنەکانە ئاگادار کرابوون. شەهیدی سەرکردە مولازم کەریم چووە بۆ سوید بۆ لای مناڵەکانی ئێمەش مەکتەبی سیاسی پارتیمـان ئاگادار کـردەوە لە وەزعەکە. ئەوانیش لـە ڕێگای خۆیانەوە ئـاگاداری لیواکەی یەکێتییان کردبووە. پێیان وتبوون ئێوە دیارە نیازی خراپتـان هەیە ئەگینـا ئێمە قەرارمان ئەوەبوو هێزی پێشـمەرگە کەم بکەینەوە کە لەیەک سـوپادا ڕێکیان بخەین بۆ کـورد. ئەوانیش پێیان وتبوون کە نیازمان هەیە پەلاماری کەرکوک بدەین لەکاتێکی پێویسـتدا. بەهەرحاڵ مەکتەبی سیاسـی پارتیش بڕیـاری دا کە قادرقادر وحەمیدە فەندی لیوایەکی کۆماندۆ دروسـت بکەن بۆ ئەو کادرە سەربازیانەی کە لە نێوشاری سلێمانیدان بەڵام دیاربوو کات لەبەر دەستی پارتی نەمابوو. چوونکە یەکێتی زۆر پێشـتر خۆیان ئامادە کردبوو. لیوایەکیان کردبووە بە سەرپەرشتی ئاواتی شێخ جەناب. لیواکەی ئەوان ئامادە بوون بۆ شەڕ کردن لە گەڵ پارتی.

هەتاوەکو لە ١ ئادار لە یاریگای سـلێمانی ئاهەنگ کرابوو لەوێ شەڕ دروسـت ببوو لە بەینی قوتابیان و خوێندکاران، ئەو شـەوە کۆمەڵێک قوتابی لێیان درابوو بە سـەر و چاوی خوێناویـەوە هاتن بۆ لقی٤ لەو کاتەدا مەسـئولی ڕێکخستن خوالێخۆشـبوو نیزامەدین گلی لێ بوو ئەو لـە جێگای مولازم کەریم بوو ئیتر وردە وردە بۆنی شـەڕ لەناو شـاردا

بڵاو بـــووەوە. دوای ڕۆژێک لە قەڵادزا خوالێخۆشــبووان عەلی حەســۆ میرخان و عەلی کانی بەبیان بەیەکتر بەکوشت دا ئەحمەد سالیح بەگ لە ڕانییە گوللەباران کراو چەند شــەهیدێکی تری لێ کەوتەوە ئینجا شەوێ خوالێخۆش بوو جەلالی حاجی حســێن وتی ئەگەر بەخوێنی خۆشم بێت ناهێڵم شەڕ دروست بێت، شەوەکەی بەڕێزان قادر قادر و نزامەدین گلی و کەمال حەسەن چوون کۆبوونەوە بوو لە محافەزەی سلێمانی بۆ گفتوگۆ، بەڵام دیار بوو سالار عەزیز پێش ئەوە وەعدی دابوو کە پارتی لە شاردا نەهێڵێت، قوەتێکی نارد بۆ حەسیب ساڵح بەچەکی قورس و سوک. هەر شەوەکەی ٣٠ مەلایەک زیاتر بوون هاتن بۆ لقی ٤ بۆ ئەوەی دڵنەواییمان بکەنەوە کە یەکێتی ناردبوونی کە شەڕ دروست نابێت. لەوکاتەدا لە لقی ٤ من و کاک نەبەز و ئەنوەری حاجی عوســمان و حەمەی مام عەلی و مەلا فائق و مەلا جەبار و ســەلامی فەقێ عەلی و خوالێخۆشبوو حەمەی ئامۆزا و لەگەڵ ٣٥پێشــمەرگەی ناســری خولەپیزەی لێ بوو. مەلاکان دڵ تەئمینیان کردین کە یەکێتی شــەڕ ناکات بــەڵام لەوکاتەدا یەکێتی قوەتی زیاتری نارد بۆ ســەر حەســیب ســاڵح کاک نەبەزیش ئاگاداری شەهید جەلالی حاجی حسەین کرد کە ئەوان هاتونەتە بەرامبەرمان کاک جەلالیش لەگەڵ دوو خوشــکەزای خۆی چوو کە دەریان بکات بۆ ئەوەی وەزعەکە ئەهوەن بکاتەوە شــەهید جەلال کوژراو خوشکەزاکەی بریندار بوو ئینجا بەیانییەکەی دایان بەســەر ئێمەشــدا منداڵان و خوێنکارانیان هان دا هاتنە بەر دەرگا و هەندێ تەقە کرا بەڵام بێ سوود بوو چوونکە دیــار بوو برادەرانی یەکێتی ئەیانویســت یــەک دوو منداڵ بکوژین ئینجا مزاهەرەمان لەسەر بکەن بڵێن ئەوەتا قوتابی و خەڵکی مەدەنی کوژراوە و ئەوەشــیان کردە پیشەی هەمیشەیی لەوەو دوایان دوای سەعاتێکی تر هەر کۆڵیان نەیا ئەم جارە ان هێزی پێشــمەرگەی خۆیان تێکەڵ کرد و برادەران هەندێکیان بەیانی لقی چواریان بۆ چۆڵ کردن و ئەوەبوو من و حەمەی مام عەلی و خوالێخۆشــبووان حەمەی ئامۆزا و غەفور مەنمی و ناسری خولەپیزە، ٢٥ پێشمەرگەیەک نەبووینماینەوە. بۆ جاری چوارەم و پێنجەم منداڵانیان پێش خۆیان داو ئەم کەرەتە هاتنە ناو لقەوە، هەندێ بریندارمــان هەبوو بەڵام دانمان با خۆمانــدا گرت و تا هیچ قوتابیەک و

کەســێک شەهید نەبێت، ئێمە بە ناچاری بۆمان چۆڵ کردن و چووین بۆ ناوچەی ســلێمانی کە لە فلکەی کاوەی ئاسنگەر بوو کە چووین لەوێش شــەڕ هەر بەردەوام بوو، ئێمە لەوێ ماینـــەوە تاکو ئێوارەیەکی درەنگ دوایـــی زۆر بەچاکمان زانی کە من و عەمید ســـەرحەد و لیوا ئەحمەد و حەمەی مام عەلی و کامیلی مەلا حەســـەن و نامیق پێنجونی و شـــەهید کەمال سابیر و خوالێخۆشبوو حەمەی ئامۆزاو شێخ فازیل و دکتۆر ئازاد و کامەرانە ڕەش وکەمال و نەقیب ســـەلام و چەندین پێشمەرگەی تر کە ئێستا ناویانم لەیاد نەماون، لای تووی مەلیک بگرین بۆ ئەوەی قورسایی شەڕ لەسەر ناوچە کەم بێتەوە و شەوێ هەرچ کەسێک بیەوێ لەگەڵماندا بێت جارێکی تر لە شـــارباژێڕەوە دەســـت پێ ئەکەینەوە، ئەوەبوو لای تووی مەلیک شـــەڕ دروست بوو چەند کەسێکمان لە لیوای تایبەت گرت، بەڵام چەکەکانمان لێ وەرگرتن و ئازادمان ئەکردن.

شـــەڕە نەگریسەکەش دروست بووئێمە لە شـــاردا ماینەوە بۆ ئەرکی حزبایەتـــی، ئیتر دوای شـــەڕەکە چوویـــن بۆ پیرمـــام لەهاوینەهەواری ســـەلاحەدین دوای ماوەیـــەک مامەوە لـــەوێ گفتووگۆی شـــەڕ ڕاگرتن دروســـت بوو، دیار بوو گفتووگۆکان نەتیجەیان نەبووبوو. شەڕ لەهەموو ناوچەکانەوە زۆر بە قورسی هەبوو. ئیتر گواسترامەوە بۆ شاری دهۆک و بوومـــە فەرمانبەری ئاســـایش و ئەوکاتە دوژمنانی کـــوردو پارتی و نەیارانی و دەســـتی پیلان گێڕانی دەرەکی ئەیانویست تەقینەوە لەدهۆک بکـــەن بۆیە پارتی هەوڵی دا دهۆک و زاخـــۆ پارێزراوبێ ئیتر بەهیمەتی هەمووڵایەک لەماوەی دووساڵدا نەمان هێشت کە هیچ پیلانێکی دوژمنان سەرکەوتووبێت، پیلانەکانیانمان پووچەڵ ئەکردنەوە.



ساڵی ٢٠٠٦، دڵشاد بارزانی، کەریم عەبدوڵا مارف

ئیتر بەرەو ئەوروپا بەڕێ کەوتم لەساڵی ١٩٩٦ دوای ماوەیەکی کورت لە١٨-٣- ١٩٩٦ گەیشــتمە هۆڵەندا لەوێ هەندێ لە برادەران زۆر خۆش حاڵی خۆیان دەربڕی و بۆ بەخێرهاتنم زۆر بە جوامێرانە پێشوازییان لێ کردم، لەوانە شــامیلی حاجی جەمال و نوری زەرەنگەر و کەمالی کاکە حەمەو باجی خانی خوشــکی و گوڵە نام بەرپرسی ئافرەتانی هۆڵەنداو برای بەڕێز کاک عەبدولڕەحمان پێداوی ئەوکاتە بەرپرسی حیزبی ئەوروپا بوو کە زۆر یارمەتی دام، بە گشــتی هەڤاڵانی پارتی زۆر هاوکارم بوون لە هەرجێیەک پێویســتم پێیان بوایــە. ووردە ووردە لەخۆ گونجاندن و لەناو کەلتورێکی وا جیادا. لەلای خۆشمان گەرمەی یەکتربرینەوە بووین، تروسکاییەکی تیا بەدی نەئەکرا هەرلایەک و لاکەی تری بە خائین ئەزانی شــەڕی برا کوژی لە قەڵادزێ و ڕانیە و کلّپەی ســەند و کوژانەوەکەی زۆر زەحمەت بوو لەو ســەردامانەدا بەهەزارەها کوڕی کورد و گەنج و لاو

پیــر و ژن و منداڵ و بەرەو هەنــدەران ئەهاتن ڕەوێکی بەئەدەبانە ڕووی لە کوردســتان کردبوو. کەم کەس هەبوو بێ لایەن بێ، مەگەر خەڵکێکی زۆر داماو ئەگینا زوربەی خۆی ساخ کردبوەوە لە ئەورووپاش خەریک بوو دەســتی پێ ئەکرد. بەڵام تفەنگی تیا نەبوو لێرەش هەرکەســەو بەلای حیزبــی خۆیدا ئەچــوو ووردە ووردە ئەو توند ڕەوییەی حزبایەتی کە لە کوردستان کەم بووە تەئسیری خۆی هەبوو.

دوای ئــەوەی کاک عەبدولڕەحمان پێــداوی پەیوەندی پێوە کردم و یارمەتی باشــی دام لەئیشی ڕۆژانەی کەمپداو خوێندنەوەی نوسراوەکانی وەزارەت کەبۆم ئەهات، وەرگێڕانی لەزمانی هۆڵەندیەوە بۆ کوردی و خوای گەورەش ڕێکی خست لەماوەیەکی کەمدا وەڵامی وەزارەتم وەرگرتەوە بۆ مانەوەی هەمیشەیی لە هۆڵەندا و مافی ئەوەشم هەبوو کە داوای خێزان و منداڵەکانم بکەم کەبۆم بێنن سوپاس بۆ خوا ئەوانیشم بۆ هات دوای ئەوە پەیوەندییەکی باشــم پەیدا کرد لەگــەڵ دکتۆر کەمال کەرکوکی ئەوکات بەرپرسی لقی ٦ بوو، دوای ئەو ئینجا بەڕێز هۆشیار زێباری دوای ئەویش ڕێزدار دڵشــاد بارزانی پەیوەندی زۆر توندو تۆڵم هەبوو بۆ بەهێز کردنی پارتیمان.

کەوتینە سەرڕێی خۆمان لە هاتووچۆکردنی قوتابخانەوفێربوونی زمانی هۆڵەندی وخۆگونجاندن لەگەڵ کلتورەکەیان. خۆشــم بەهەمان شــێوەی کوردســتان و گرێــدان بەخەباتی ئەورووپاوە لەگــەڵ پارتی هاوکاربووم لەزۆربــەی زۆری چالاکیەکانــی ئەوکاتەی پارتی بەشــداریم کردوە زۆر بەســەرکەوتوانە دوای ماوەیەک لەهۆڵەندا ڕێکخراوی پلاتفۆرمی کوردی دامــەزرا کەپێک هاتەی زۆربەی زۆری ڕێکخــراوە کوردیەکان بوو منیش بەشــداربووم لەدەســتەی بەڕێوبردن لەگەڵ ئەم بەڕێزانە (ئازاد میرانی و ئەســعەد عەدۆ و حاکم تۆفیق ڕەواندوزی و کامیل ســاڵەیی و ساسان دەروێــش و ئیدریس بەربهاری و نەزیرەی مەلاکەریــم وگوڵنام ئاکرەیی وبەندەو کۆمەڵێک کەســانی دڵســۆزو نیشــتیمان پەروەری وەک ئاری هەرسین و ناجی ئاکرەیی و کۆمەڵێکی تر ....هتد

ئـــەم کۆمەڵەیـــە کاری ئەوەبوو کەکلتوری نیشـــتیمانی و نەتەوەیی کورد نیشـــانی کۆمەڵگای هۆڵەندا بدەن و چـــۆن بتوانن کورد بگونجێن لەو وڵاتەدا ئەویش بەســـەردان و بەسەرکردنەوەی پەرلەمانی هۆڵەندی و دەزگاکانـــی تری پێوەندداربە پەناهەندە، لەئاڵوگۆڕ کردنی پەیامی کوردو گەیاندن بەشوێنی بڕیاردان لەوڵات .کەئەمەش خۆی ئەدالەسەدان چالاکی جۆراوجۆر وهاوکاری کردنی نوێنەرایەتی کورد لەئەورووپا لە وڵاتی بەلجیکا کەچەندچالاکیەکمان بە ئەنجام گەیاند.

لەوێش ســـاڵی١٩٩٨ لە برۆکسڵ بە ئامادە بوونی ڕێزدار کاک دڵشاد بارزانـــی و وەکیلی وەزیری خاریجی وڵاتی بەلجیـــکا و بوورهان جاف و کاک عەبدول ڕەحمان پێداوی خوالێخۆشـــبوو حەمەغەریب کاکە ڕەش و ئازاد میرانی و چەندین کەسایەتی تری کوردستانی و ئەورووپی مەکتەبی پارتیمان و حکومەتی هەرێمی کوردستانمان کردەوە و ئاڵای کوردستانمان هەڵ کرد. شایەنی باسە کە هەندێ کەسی دوژمن بە کورد بەو وەزعە زۆر دڵ گران بوون وویســـتیان ئاژاوەمان بۆ دروســـت بکەن بەڵام ئاگادارمان کردنـــەوە کە زۆر بە توندی وەڵامتان ئەدەینەوە ئەوانیش ڕۆشـــتن، هیچ ڕووی نـــەدا دوای ئەوە گەڕاینـــەوە بۆ هۆڵاندا. لـــە هۆڵەندا بەهاوکاری بەرپرســـی ناوچە ئیســـماعیل دەلۆ لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا بەشداریمان ئەکـــرد، هەروەها لە بۆنەو ئاهەنگی هۆڵەندیدا وەکو کورد بەشـــداریمان لە چالاکیەکانیان ئەکرد. دوا بە دوای ئیســـماعیل دەلۆ، ئازاد میرانی و ڕەئوف سندی و ســـەفەر زاویتەیی و عومەر زاویتەی بوون بە بەرپرسی ناوچە زۆرجار چالاکیمان هەبووە شـــان بەشـــانی وڵاتانـــی تر لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا باسی وەزعی کورد و کێشەی نەتەوەکەمان بۆ ئەکردن. لە ساڵی ٢٠٠٦ لەگەڵ بەرپرسی ناوچە عومەر زاویتەی چووین بۆ بەرلین بۆ کۆبوونەوەیەک لەگەڵ ڕێزدار کاک دڵشاد بارزانی بۆ کارو باری پارتیمان و کۆکردنەوەی هەموو کوردە فەیلیەکان کە چەندین ساڵە لە دورە ووڵات بـــوون و دوور بـــوون لە کۆڕی کوردی و نزیـــک کردنەوەیان لە پارتی و بارزانی. ڕێزدار دڵشـــاد بارزانی و محەمەد مەعروف بەرپرســـی مەکتەبی

پێوەندیەکانی دەرەوەی وڵات زۆر دەســت خۆشــی لێ کردم و سوپاسی پارتی پێ ڕاگەیاندم بۆ ئەو کارە نەتەوەییانە کە لە وڵاتانی ئەوروپا پێی هەڵدەســتم. منیش پەیمانم دایە کە هەمیشــە هەرچی لەتوانامدا بێ بۆ میللەتەکەمانی ئەنجام ئەدەم بێ ماندوبوون.




لای ڕاست (لە سەرەوە بۆ خوارەوە): فازیل فەیلی، سیامەند بەنا (سەفیری ئەوکاتــی عێراقا لە هۆڵەندا)، ئەبو عەلی فەیلی، عەنوەر عەبدول ڕەحمان، ئەبو ڕافــد، کەریم فەیلــی (بەڕێوبەری جەمعیەی فەلییەکان)، ئەبو ســامی، عومران فەیلی، ئەبو یاقوب، یسف فەیلی.

لای چەپەوە (لە ســەرەوە بۆ خــوارەوە): کەریم عەبدوڵا مارف، ئەبوعەلی، ئەمجەت فەیلی، سەلام غوڵام فەیلی، سلاح فەیلی، مۆفق عسفور فەیلی.

**دڵشاد سۆران — هۆڵەندا**

لەگەڵ بەرەوپێش چوونی کوردستـــتان لە هەمووبوارێکی ژیانداو دابین کردنی خۆشگوزەرانی تەواوی خەڵکی هەرێمی کوردستان و چەسپاندنی یاســاو ڕێزگرتنـــی مافی مرۆڤ و یەکخســـتنی زیاتـــری نێومالّی کورد وبەشـــداری کردن لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق و بوونی پێگەی کورد لە هاوبەشـــی بەڕێوەبردنـــی حکومەتی عێراق، هەموو ئەمانە بەگشـــتی ڕەنگدانەوەیان هەبووە لەســـەرکوردی تاراوگە بـــۆ لەیەک نزیک بوونەوە و خۆ ڕێکخســـتنەوە لە نێو کۆمەڵـــە کوردیەکانی تاراوگە لەپێناوی یەک هەڵوێستی ویەک دەنگی و ئاراستەکردنی بۆ دنیای دەرەوە،لەم ماوەیەدا بینیمان لە شـــارێکی گەورەو گرنگی پڕ لـــە کوردانی ئارنهێم ی هۆڵەندا کۆمەڵەیـــەک بە ناوی (کۆمەڵەی هیوای کورد) خـــۆی ڕاگەیاندو بووە پێگەیەک بۆ هیوای زیاتری یەک بوونی کوردان.

ئێمەش بەپێویستمان زانی لەسەر دروست بوونی ئەو کۆمەڵەیەو کارو چالاکیەکانی ئەم گفتوگۆیە سازبکەین لەگەڵ بەرپرسی کۆمەڵەکە بەڕێز( کەریم عەبدوڵڵا مارف ئاغا) کە کەســـایەتێکی ناســـراو پێشمەرگەیەکی دێرینـــەو خۆشەویســـتی دەوروبەرەکەیەتی کە کوردانی ئەو شـــارەی لە نێوبارەگای ئەو کۆمەڵەیەدا ڕێک خســـتۆتەوە لەســـەر پشت بەستن بە هەڵوێست و دڵسۆزی بەڕێزیان.

**پ/ دەکـــرێ بیرۆکەی دروســـت بوونی ئـــەم کۆمەڵەیەمان پێ بڵێی لەکوێوە سەرچاوەی گرتووە؟**

و/ هەر وەک دەزانن پێش دروســـت بوونی ئـــەم کۆمەڵەیە،چەندان کۆمەڵەی تر هەبوون کە لەژێر ناوی جۆرا و جۆردا دامەزراون،بە درێژایی هەبوونی کورد و ئەو کۆچە بە کۆمەڵەی کە لە دەساڵی ڕابردوودا ڕوویان لە کیشوەرە ساردەکانی ئەورووپا کرد،وەکو پێویستێکی کورد بە درێژایی ئەو مێژووە کۆمەڵەکان هەبوون بەپێی کاروچالاکیەکان تەمەنیان بڕیوە،

بەڵام ئەوەی جێگای نیگەرانی بوو بۆ کوردی تاراوگە شەڕی نێو خۆ بوو کە کوردی لەیەک دوور خســـتەوە بۆ پەرتەوازە بوون،ئێمەو دڵســـۆزانی کورد لە دوای هێوربوونەوەی نێوماڵی کورد و ڕێکخســـتنەوەی لەهەرێمی کوردستان،هەوڵێکی زۆرمان دا لەپێناوی لەیەک نزیک کردنەوەی خێزانە کوردەکان وبیرکردنەوە لە ڕێکخســـتنەوەیان لەنێو کۆمەڵەیەکی نوێ دا کە توانیمان هەر بەهەوڵ وکۆششی کوردەکان خۆیان وەک هەڵوێستێکی نەتەوەیـــی و یەک ڕیـــزی دەنگی کورد و کۆکردنـــەوەی هێز و تواناکانی کورد کۆمەڵەی هیوای کوردمان دامەزراندو لە نێو ئاهەنگێکی بەرفراوانی کوردانی شـــاری ئارنهێم قردیلەی چوونە ژوورەوەی بارەگاکەمان لە ڕۆژی یەک شەممە ڕێکەوتی ٢٤-٦-٢٠١٠ بڕی وکۆمەڵێک وتار و وتەو بروسکەی پیرۆزبایش خوێندرایەوە بەو بۆنەیەوە،کە ئەمەش سەرەتایەک بوو بۆ بە فەرمی بوونی کۆمەڵەکەمان لە تۆمارکردنی لە ژووری بازرگانی هۆڵەندا.

**پ/ ناونـــان لەکۆمەڵەکەتان ڕێکەوت بوو یان لەوەو پێش لەســـەری ڕێکەوتبوون؟**

و / دیارە بۆ هەموو ناونانێک لەدەســـپێکدا گوڵ بژێرێک دەکرێ بۆی لەسەر ناونان ئایا بۆ هەرشتێک بێت تەنانەت بۆ ناوی منداڵەکەی خۆش بێـــت، ئێمەش وەک ئـــەم کۆمەڵەیە بڕوامان وایە لەســـەرەتاوە کەکاری پێ بکەین لەنێو خۆماندا ڕای گشـــتی هەموومانـــە بۆ بڕیارێک بدرێ لە چوارچێـــوەی کۆمەڵەکەماندا،بۆیـــە بە هەمووومان بـــە تێکڕای دەنگ بۆ ئەم بارودۆخەی کوردســـتان و ڕەوشـــی پەنابەران بە باشمان زانی ناوی لێ بنێین کۆمەڵەی هیوای کورد، ئێمەی کوردی تاراوگە بە هەمیشـــەی هیوامـــان بە کورد بوونی خۆمان هەیەو بە داهاتووی کوردســـتان هەیە، خەبات کردنیش بۆ هیوایەک کە خەونی لەمێژینەی هەموو تاکێکی کوردە کە کورد بە ئاواتەکانی خۆی بگات ولەسایەیدا ئازادو یەکسان بژین.

**پ / باســت لە فەرمی بوون کرد لــە ژووری بازرگانی هۆڵەندی،ئەم فەرمی بوونە چی دەگەیەنێ؟**

و / هەروەک ڕوون و ئاشــکرایە لە نێو کۆمەڵگای هۆڵەندا کۆمەڵێک نەتــەوە و کلتوری جیاواز لە تەکیاندا دەژیــن و مافی پەنابەریان هەیە هاوشــێوەی کوردی خۆمان،ئەگەر بێت و بتەوێ بە ڕەسمی کار بۆ ئەوە بکــەی وەک هەر نەتەوەیەکی تری پەناهەندە و نیشــتەجێی ئەم وولاتە پێوەندیەکی پتەو دروست بکەی لەگەڵ حکومەت و لایەنەکانی دەستەڵات و هەموو ئەونەتەوە جیاوازانە دەبێ بە فەرمی خۆت ڕابگەیەنی لە ژووری بازرگانــی و پەیڕەو پرۆگرامیش هەبێ بۆ پشــت بەســتن بۆ کارکردن، لــە دوای تەواوبوونی ئەمانە دەناســرێت و هاوکاریت دەکەن،ئێمەش بۆ ئەم مەبەســتە هەر زوو ناوی خۆمان تۆمار کرد و پرۆژە دەســتوریەکی بەڕێوەبردنی کۆمەڵەکەشمان پێشکەش کرد و خۆش بەختانە پەسەندکراو کەوتینە کارکردن .

**پ / دەتوانین بپرســین ئەو پرۆژە یاســایەی کــە کاری داهاتوتانی لەسەر دەکەن کورتەیەکی بزانین؟**

و / بێگومان دەتوانن بزانن، چوونکە ئێمە پێش دەست بەکاربوونمان برۆژەکەمان خســتۆتە بەردەست خێزانە کوردەکان کە بزانن ئامانج چی یە،بۆ کردنەوەی ئەم کۆمەڵەیە و دەتوانێ بە چ شێوەیەک خۆی بگونجێنێ لەگەڵ خواستەکانیان کە ئێمەش لەم خاڵانە پەیڕەوی بکەین کە ئەمەش بەشێکە لەبەرنامەی گشتیمان .....

١- ناوی کۆمەڵەی هیوای کورد لەشاری ئارنهێم ی هۆڵەندا.

٢- کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیری وکۆمەڵایەتی وفرە کەلتورە،کۆمەڵەیەکی ئارەزوومەندانەی خێزانی کوردی یە لە هۆڵەندا وکوردســتان بە بەرچاو ڕوونی کار دەکات .

٣- هەرکەســێک ئارەزوومەندبێــت جگە لە کورد بەشــداری بکا لە کۆمەڵەی هیوا،جیا لە نەتەوەی کورد ئەندامی فەخری دەبێت .

٤- هەڵبژاردنی دەستەی هیوا لەسەر توانای مرۆڤ ولێ هاتووی وكارامەیی دەبێت .

٥- بڕیار دان لەسەر زۆرینەی دەنگ دەبێت لەكاتی گرت بوونەوەیی گشتی دا.

٦- ئەندامانی كۆمەڵەی هیوا بەم پرۆگرامە كاری باش پەیرەودەكەین.

٧- دەستەی هەڵ بژێردراو بەرزترین دەستەڵاتە بۆ بەڕێوەبردنی كارە جۆراو جۆرەكانی ئەم كۆمەڵەیە لە بڕیاردان بە ئاشكراو ڕوون.

٨- هەمووخێزانە كوردەكان بەتایبەتی لە شاری ئارنهێم ودەوروبەری دەتوانن دەوریان هەبێ .

٩- لەتەمەنی دیاری كراودا دەبێ ڕۆڵ وچالاكی بەرچاوببینێت و ببێتە ئەندامێكی كارا لەپەیوندی كردن و ناساندنی دۆزی ڕەواكەی كورد بە دەوروبەر گرنگە.

١٠- وانەی زمانی دایك بۆ منداڵانی كورد لەزۆر بواردا.

١١- بواردان بە سیمیناروكردنەوەی خول وباس كردنی كێشەكانی كوردانی دەرەوەی ووڵات و.... تاد

١٢- كۆمەڵەی هیوا بەردەوامە لە سوود وەرگرتن لە یاسای هۆڵەندی بۆ خۆناسین وناساندنی میدیاكان بە شێوەیەكی یاسایی بەچنگ بێنێ .

١٣- بیرەوەری و سەروەریەكان و دەسكەوتە مێژوویی و نەتەوەییەكەمان بەهەند دەگرین .

١٤- ڕێكخستنی دانیشتنی خێزانی و پێشبڕكێ بۆ منداڵان و گەشتوگوزار .....هتد

١٥- بەرهەمهێنانی گۆڤارونامیلكە بۆ منداڵان بەپێی تواناكانی ئەندامەكان .

١٦- ڕێكخستنی دەستەی هەڵپەڕكێ وشانۆی كوردی وسازدانی پێشانگاو هەلی لەبار بۆ وێنە كێشان.

١٧- دەســـتەکەمان بەردەوامە لە پێوەندی کردن بە کۆمەڵە کوردی وهۆڵەندیەکانەوە .

١٨- پێوەنـــدی کردن وهەنگاونان بـــۆ پەیداکردنی پێوەندی لەگەڵ ڕەوەندەکانی تر .

١٩- دەرفـــەت دان بەگەنجان وهاندانیان بـــۆ وەرزش ودامەزراندنی تۆپی پێ وبالەبۆیان .

٢٠- هەرهاوکاریەکـــی هۆڵەندی وغەیرە دەبێتە دیاری کۆمەڵەکەمان ولەکاروچالاکی بۆکۆمەڵەکەمان تەرخان دەکرێت

**پ / پێتـــان نەوتیـــن ئەوانە کێن کە لەولیژنانەش بەشـــدارن وەک لیژنەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵەکە؟**

و / وەک دەستەی یەکەم و دامەزرێنەری کۆمەڵە کە بەندەو کۆمەڵێک کەسانی نیشتیمان پەروەروخۆشەویستی ناوخەڵکانی کورد هەستاوین بە دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە،بۆ پێکهێنانی کۆمەڵەکەش پشـــتمان بەست بەهەیکەلـــی ئیداری هۆڵەندی وئێمەش لەســـەرئەوبنەمایە کۆمەڵەکەمان دامەزراندو دواتر بە فەرمی تۆمارمان کرد کە لەم شێوەیەدا بوو......

١- سەرۆک بریتیە لە بەندە (کەریم عەبدوڵلا مارف ئاغا)
٢- سکرتێر بریتیە لەبەڕێز (ئەکرەم مۆهان فەیلی)
٣- ڕاگەیاندن بریتیە لەبەڕێز (ئارام مەحمود)
٤- پێوەندی بریتیە لەبەڕێز (ئومێد) و (یاسین شێخ جەلال)
٥- دارای بریتیە لەبەڕێز ( فەلاح ئەحمەد)

**پ / لەوپرۆژە گشتیەی کە باستان لێوە کرد،هیچ کام لەو چالاکیانەتان بە ئەنجام گەیاندوە؟**

و / بە دڵنیایەوە جگە لە ئاهەنگی کردنەوەی بارەگای کۆمەڵەکەمان وبەشداری کردنی چەندین کەسایەتی کوردی هەمووپارچەکانی کوردستان وخوێندنەوەی وتەو وتارەکانیان و بروســـکەی پیرۆزبایەکانیان، هاوشانی

هەنــدێ کۆمەڵەی کــوردی تــر توانیومانە ئاهەنگی جەژنــی نەورۆزی نەتەوەیمــان بگێڕین بەجیــا و ڕۆژی ئاگرکردنــەوەی نەورۆزیش بکەین بە ئامادەبوونی کوردێکی زۆر لە ناوەڕاســتی شــاردا،هەروەها ئاهەنگی ڕیزلێنــان لە ڕۆژی ئافرەتانی جیهان و بەرزڕاگرتنی یادەکەیان بکەین بە ئاهەنگێکی خنجیلانەی خێزانی ئافرەتــان خۆیان،هەروەها نوێنەرایەتی کۆمەڵەکەشمان بەشداربوون لە هەموو بۆنە نیشتیمان و نەتەوەیەتیاکانمان لەگەڵ کۆمەڵەو لایەنەسیاســی یە کوردیەکان کە ئەمەش هەرشەڕەفێکی گەورەیە بۆ چالاکی وبەشــداربوونی کۆمەڵە کەمان، جگە لە بەشــداری چەندین پرسەو سەردانی نەخۆش و بەسەرکردنەوەی خێزانە کوردەکان، هــاوکات لەگەڵ ئەم کاروچالاکیانەش لەمــاوەی ڕابردووی کۆمەڵەکەمان هەندێک یاریمان ڕێکخســت بۆ گەنجان لەتۆپی پێ وبالە لەتیپی وەرزشی کۆمەڵەکەمان،خوا یار بێت زۆرکاری گەورەمان لەبەردەســتە بە هاوکاری هەموولایەک بتوانین بە ئەنجامیان بگەیەنین .

**پ / ئەو ڕەوشــە قورس وگرانە بەسەر پەناهەندەی بێ وەڵامدا تێ دەپەڕێ بە دەرکردن و ناردنەوەیان تاکەی بەردەوام دەبێ؟**

و / لــە دوای کــۆی بڕیــاری یەکێتی ئەوروپا و نــارەزای خەڵکانی ئەوروپــی و وەرنەگرتنی زیاتری پەنابەران لــە هەموو دنیاوە،بارودۆخی ئەوانی ئاڵۆزکردوە لە کەم و کوڕی خزمەت گوزاریەکانیان بەگشــتی وتێ پەڕاندنی دژواری ژیانی پەنابەران،ئەوبووجەی کە ساڵانە تەرخان دەکرێ بۆ پەنابەرانی بیانی بەگشتی، ئەوروپیەکان دەتوانن کۆمەڵێک لەوخەمانەی خۆیانی پێ دابین بکەن،لەشانسی پەنابەرانیش ئەمڕۆ جیهان بەقۆناغێکی جیاوز لە جاران تێ دەپەڕێ بە دەســت ســەختی ئابووری وکێشەی بێ کاری و زۆری خەڵک و نیشــتەجێ بوون، هەموو ئەم فاکتەرانە بوونە تە هۆکاری پێ لەسەر داگرتنی وەرنەگرتنی پەنابەران وبەردەوام بوونی ژیان بەڕێ کردنی سەختی ژیانیان لە چاوەڕوانی و نەگەڕانەوەی وەڵامەکانیان وبــێ هیوا کردنیان بۆ ئەوەی خۆیان بڕیــاری گەڕانەوەبدەن کە ئەمەش

زۆر زەحمەتـــە هەموو پەنابەران لـــە وولاتەکانی خۆیان لە جێگاو ڕێگای خۆیان هەڵکەنراون و زەحمەتە بۆیان، خۆیان بڕیاری گەڕانەوە بدەن کە ئەوروپیەکانیش ئەم ڕاستیە ئەزانن بەلاًم فشاری خەڵکی خۆیان وایان لێ دەکات پێ داگرن لە ســـەر وەرنەگرتنی پەنابەرانی زیاتر بەلاًم بیر لەوە کراوەتەوە لە ڕێگای هاوکاری وکۆمـــەک کردنی ئەوپەنابەرانەی کەچەند ساڵێکە بێ وەلاًمن لەڕێگای حکومەتی خۆیانەوە بیان گەڕێننەوە کە زۆر جـــار ئەمەش توندوتیژی لێ دەکەویتەوە کە ئەمەش بڕیاریکی ئەوانە لێ پاشـــگەز نابنەوە، ئیتر نازانم ئەم ڕەفتارەیـــان تاکەی دەبێ وبەردەوام دەبن لەسەری.

**پ / وەکو کۆمەڵەکەتان تا چەند پابەندن بە حکومەتی کوردســـتان و بڕیارەکانی؟**

و/ ئێمـــە لـــە دووری کوردســـتان وبڕیارەکانـــی حکومەتی هەرێمی کوردســـتان لە نێو وولاتێکی بێگانە دا کۆمەڵەکەمان دامەزراندوە،لەسەر بنەمای یاســـای هۆڵەندی وپەیڕەوکردنی بڕیارەکانی،بەلاًم ئەم کارەمان ئەوەناگەیەنـــێ کە ئێمە کوردســـتانی بوونی خۆمـــان لەبیرکردبێ،ناوی کۆمەڵەکەمان ســـەلماندنی ڕاســـتی وتەکانمە کە ئێمەی کوردی تاراوگە بەهەمیشـــەی بەهیوای ئەوەین کوردوکوردســـتان بەئامانج وئاواتی خۆی بگات لە مسۆگەر کردنی مافەکانی، کە ئێمەوەک کۆمەڵەکەمان هاوکارێکی باشـــی کورد بووین بۆ هۆشیارکردنەوەیان و گەیاندنیان بۆ سەرسندوقی دەنگـــدان بۆ پەرلەمانی عێراق ومســـۆگەرکردنی دەنگی زیاتری کورد لە نێو پێگەی حکومەتی عێراق،بە داخەوە تا ئێستا حکومەتی هەرێم بیری لەوەنەکردۆتـــەوە کە هاوکارمان بێت لەپشـــت گیری کردنمان ودەســـت گیرۆدەیمان بەگشـــتی لەکوردانی تاراوگە، کەبتوانینن زیاتر وەکو کورد پێگەی خۆمان قایم بکەین لەم وولاًتانە کە بۆ ئایندەی کوردوکوردســـتان هێزێکـــی پڕ لە وزە و بە توانابـــن، هیوادارم ئەم خاڵە بە جدی وەرگرێ حکومەتی هەرێمی کوردستان لەکاری ئێستاو داهاتووی.

**پ / دوا وتەتان چییە؟**

و / بە ناوی لیژنـــەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵەکەمان (کۆمەڵەی هیوای کورد) لە شـــاری ئارنهێم ی هۆڵەندا،سوپاسی بەڕێزتان وتەواوی ستافی گۆڤارەکەتـــان دەکەین وهیوای بەردەوام بوونی زیاترتان بۆ ئەخوازین لە و هەڵویســـتە جوانەتان کە دەنگی کوردانی تاراوگە دەگەیەننەوە دایکی نیشتیمان و حکومەتی هەریمی کوردستان دووبارە سەکەوتووبن.


کۆمەڵەی هیوا، هیوایەک بۆ یەکخستنی کورد

## وتەی کۆتایی

لەکۆتایـــدا وتەیەکـــی فەیلەســـوفێکی هیندســـتانی (تاگـــوور)م بەبیرهاتەوە:

خوایە بۆ ئەوەی وشـــەی هەق بەڕووی بەهێزاندا بێژم یارمەتیم دەی و، بۆ ئەوەی وشەی ناهەق لەپێناو چەپڵە لێدانی لاوازاندا نەڵێم یارمەتیم دەی. خوایـــە ئەگەر ماڵت دامێ بەختەوەریم لێ مەســـتێنەرەوە. ئەگەر هێزیشـــت دامێ ئەقڵم لێ مەســـتێنەوە. ئەگەر ســـەرکەوتنت دامێ خۆ بەکەمگریم لێ مەستێنەوە.

ئەگـــەر خۆ بەکەمگریشـــت دامێ شـــانازیم بە کەرامەتـــی خۆوە لێ مەستێنەوە. خوایە ئەگەر سەرکەوتم، نەهێڵی لەخۆبایی بم.

ئەگەر ژێریش کەوتم بێ هیوا نەبم. بگرە هەموو کات بیرم بێنەوە کە گلان تاقیکردنەوەی پێش هەڵسانەوەیە.

خوایـــە فێرم کـــە لێبـــووردن گەورەترین مایەی بەهێزیـــە و، ئەگەر سەرکەوتنت لێ ســـەندمەوە، بۆ ئەوەی بەسەر ژێرکەوتنندا زاڵ بم هێزی لەسەرســـوور بوونم پێ ببەخشی. خودایە ئەگەر نیعمەتی لەشساغیت لێ وەرگرتمـــەوە، نیعمەتی بڕوام پێ بهێڵـــی. ئەگەر خراپەم لەگەڵ خەڵکدا کرد، بۆ داوای لێبووردن ئازایەتیم پێ ببەخشی. ئەگەر خەڵک خراپەیان لەگەڵدا کردم، بۆ لێبووردن وچاوپۆشی ئازایەتیم پێ خەڵات کەی. خوایە فێرم کە جۆن خۆمم خۆش دەوێ خەڵکیشـــم خۆش بووێ. خوایە ئەگەر لەبیرم کردی لەبیرم مەکە.

# ناوەڕۆک

# وێنەکان



ساڵی١٩٧٤ لە ڕاستەوە بۆ چەپ: ئەحمەد خەلیفە عەبدوڵا مارف، ئەوانی تر نەناسراون



ساڵی١٩٧٣ کەریم عەبدوڵا مارف



سالی ١٩٧٨ کەریم عەبدولا مارف



٨-١-١٩٧٥ له خەستەخانەی میاندواو له ڕۆژهەڵاتی کوردستان



ساڵی ١٩٧٥ لە ڕاستەوە بۆ چەپ: مەحمودی حاجی حەسەن، عەلی مام کەریم، شەهید خەسرەوی حەمدی، شەهید گزەی حەمەکەریم



ساڵی ١٩٨٠ لە ڕاستەوە بۆ چەپ سلێی قەساب، نەناسراوە، شەهید خەلیفە عەبدولا مارف



له ڕاستەوە بۆ چەپ: ئەحەی دغە، شەهید عەبەی مەلا، عومەری مام تۆفیق،
سدیقی فەیم، شەهید عەزەی حەمەکەریم





ساڵی١٩٨٠ لە ڕاستەوە بۆ چەپ: کەریم عەبدوڵا مارف، شەهید جەلال حەمەی مجە، شەهید مام هێرش (حەمەی نەجە)



ساڵی١٩٨٠، چیای قەندیل، لە ڕاستەوە بۆ چەپ: فاتیح شـوانی، کەریم عەبدوڵا مارف، خوالێخۆشبوو شێخ دارای شـێخ جەلال، نەناسراو، نەناسراو، خوالێخۆشبوو حەمەی ئامۆزا، شـێخ عومەر شێخ کەریم کەڵەکنی، بەکر پیرۆت، نەناسراو شەهید مام هێرش



سالّی ١٩٧٨ کەریم عەبدوڵا مارف، چیای ئاسۆس



**ساڵی مانگی٩ ساڵی ١٩٧٨**

**(لە سەرەوە ڕاست بۆ چەپ): کەمالی شێخە،کەریم عەبدوڵا مارف، شەهید جەمالی عەلی باپیر، شەهید سەلام کوێرەکانی، شەهید ڕەسوڵ جوبلاغی.**
**(لە خوارەوە ڕاست بۆ چەپ): سەلام سێ دەری، شەهید ئەحمەد چنارەی، شەهید مستەفا کوێرەکانی ١٩٧٨ کەریم عەبدوڵا مارف، چیای ئاسۆس**



مانگی ١ ساڵی ١٩٧٩ کەریم عەبدوڵا مارف، شاری سەردەشت



سەرەتای ساڵی ١٩٧٩ گرتنی شاری بانە



مانگی ١ ساڵی ١٩٧٩، (لە سەرەوە ڕاست بۆ چەپ): کەریم عەبدوڵا مارف، شەهید فەقێ، شەهید هێمن سەراوی. (لە خوارەوە): فەلاح



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: شەهیدی سەرکردە تاهیری عەلی والی بەگ، شەهید حەمە ڕەحیم



مانگی ١١ سـالی ١٩٧٩ ئۆردوگای زێوێ، ڕۆژی چوونم بۆ ماڵی دەسـگیرانی کاکە خەلیفەم

خوارەوە: لە ڕاستەوە بۆ چەپ: شەهید سوارەی لالە مارف، شەهید جەلال.

سەرەوە: لە ڕاستەوە بۆ چەپ: شەهید شەماڵ کەنگە کەرەی، شەهید کاکە خەلیفە، کەریم عەبدولا مارف



ساڵی ١٩٧٩
کاک نەبەز،
کەریم عەبدولا
مارف



کۆتایی مانگی ١٠ ساڵی ١٩٨٠ ،شاری ورمێ: کەریم عەبدوڵا مارف، کاکە خەلیفەم، هەرهەمان پاڵێی بەریوونی کاکە خەلیفەم



ساڵی١٩٨١، گوندی گەڕەدێ، لە ڕاستەوە بۆ چەپ (بە پێوە): عوسەی ڕابە، خەلیفە عەبدوڵا مارف، میندی، کاوەی عریف عەلی، فەلاحی حەمەی زەینەب، میندی، ئەوانی تر نەناسراون.

لە ڕاستەوە بۆ چەپ (دانیشتوو): وەستا کەمالی برای مەجیە گورگە، نەزانراوە،مەحموود شارەزووری، سەلام، ئەو سێ منالە منالی خوالێخۆشبوو مچەی بابەگەورەن، ئەوانی تر نەناسراون



ســاڵی ١٩٨٢، لە ڕاســتەوە بۆ چەپ: بەختیار حەمەی محە، شەهید بەکر کونەڵە، شەهید کاکە خەلیفە، شەهید ئازاد



ســاڵی ١٩٨٠، بناری قەندیل، لە ڕاســتەوە بۆ چەپ؛ کەریــم عەبدوڵا مارف، فاتیح شــوانی، خوالێخۆشبوو حەمەی ئامۆزا ، شێخ عومەر شــێخ کەریم کەڵەکنی، بەکر پیرۆت،ئومێد، ،شەهید جەلالی حەمەی محە



ســالی ١٩٩١ له ڕاستەوە بۆ چەپ، ســتار، دلێر مەحمود شازەمان، کەریم عەبدوڵا مارف، شەهید سدیقە ڕەش، شوانە



ساڵی ١٩٩٢ گەڕانەوەی کاک مەسعوود بارزانی بۆ مەسیف سەلاحەدین.
له چەپەوە بۆ ڕاســـت: سێیەم کەریم عەبدوڵا مارف، خوالێخۆش بوو عومەری حەمە مراد، عەریف دەروێش، دکتۆر ڕۆژ نوری شـــاوەیس، خوالێخۆش بوو جەوهەر نامیق سالم، هەندێ هەڤاڵی تر کە بەداخەوە ناوەکانیان نازانم



ساڵی ١٩٧٣ شەهید تالیب ڕۆستەم فەرماندەی هەرێمی
شەش ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان



دەیڵێمەوە بە چاوێکی رەخنەگرانەوە لە
یاداشتەکانم مەڕوانن، بە زمانێکی زۆر سادە
وێنەی وێستگەکانی ژیانم نووسیوەتەوە
لەگەڵ ناوهێنانی کۆمەڵێك هاوڕێی
خۆشەویست کە هەندێکیان بە خوێنیان گوڵی
ئازادی و سەربەستییان ئاوداو ئەمڕۆی لێ
سەوزبوو، هەندێکیشیان ئێستا لە ژیاندان و
درێژە بە خەبات و تێکۆشان ئەدەن.

٣٠٠٠دینار